# بتەکانی نەفامی

## لە نێوان ڕابردوو و ئێستادا

بتەکانی نەفامی لە نێوان ڕابردوو و ئێستادا


نوسینی
ایوب ابو سلمان

وەرگێڕان
عبدالرحمن کوردی


ئامادەکردن و پێداچوونەوەی
کۆمەڵی ڕزگاربوو

# بتەکانی نەفامی لە نێوان

# ڕابردوو و ئێستادا

نوسینی : ایوب ابو سلمان

**وەرگێڕانی:** عبدالرحمن کوردی

**پێداچوونەوەی:** کۆمەڵی ڕزگاربوو

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی دانەر

ئەم ئایەتەی کە پەروەردگار دەفەرمووێ:﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، وە وتەکەی ئیمامی عمر کە دەفەرمووێ:( إنما تنقض عرى الإسلام عروة عروة إذ نشأ في الإسلام من لا يعرف الجاهلية) واتە:(پەت و گرێیەکانی ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە پەت لەدوای پەت کاتێك کەسێك گەورەدەبێت لە ناو ئیسلام کە جاهیلیەت ناناسێت).

وە وتەکەی(حذيفة بن اليمان):(كان الناس يسألون النبي عن الخير ، وكنت أسأله عن الشر مخافة أن يدركني)[1] واتە:(خەڵك پرسیاریان لە پیغەمبەر(ﷺ)دەکرد دەربارەی کارە چاکەکان، بەڵام من پرسیارم دەکرد دەربارەی کارە خراپەکان لە ترسی کەوتنە ناو خراپەکان)، بۆیە شاعیر دەڵێت: عرفت الشر لا للشر لكن لتوقيه *** ومن لم يعرف الشر يقع فيه

واتە: خراپەم ناسی نەك بۆ خودی خراپە بەڵکو بۆ خۆپارستن لێی

چونکە هەرکەسێك خراپە نەناسێت دەکەوێتە ناوی.

ئا لەم دەستپێکەوە-پشتیوان بەخوا-دەستم کردووە بە نوسینی ئەم چەند پەڕەیە کە جاهیلیەتی سەرەتا ڕوون دەکاتەوە کە ئایا ئەوان ئینکاری پەروەردگاریان کردووە؟ ئایا ئەوان بیروباوەڕیان وابووە کە لات و عوزا و مەنات و هوبەل موڵکی ئاسمان و زەویان بەدەستە! یان پێیان وابووە کە گەورە و دەسەڵاتدارەکان مافی گوێڕایەڵی و یاسادانانیان هەیە؟!ئایا گومڕایی جاهیلەکان تەنها لە بیروباوەڕدابووە؟یان لە ڕووکردنە غەیری خوابووە بە ئەنجامدانی جۆرەکانی عیبادەت؟یان لە بواری وەرگرتنی تەشریع بووە لەلایەن غەیری خواوە؟یان لە وەرگتنی حەڵاڵدانان و حەرامدانان بووە لە لایان گەورە و دەسەڵاتدارەکانیان کە دینی پێغەمبەر ئیبراهیمیان گۆڕی؟!

---

[1] صحيح مسلم:٣/١٤٧٥

هەموو ئەمانە لێکۆڵینەوەی دەربارە دەکەین–بە ئیزنی خوا–لە ژیانی جاهیلیەت پێش ناردنی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەگەر هەموو جۆرەکانی گومڕایی و لادان لە جاهیلیەتی کۆن بزانین بۆمان ئاسان دەبێت دیاریکردن و چارەسەرکردنی ئەو کەلێن و درزانەی کە لە جاهیلیەتی ئێستادا بوونی هەیە، وەکو دەوترێ:(وبضدها تتبين الأشياء)(بالمثال يتضع المقال)واتە:(بە پێچەوانە و دژەکان وە بەنموونە شتەکان ڕوون دەبێتەوە)ئەمانەش هەموو دەچێتە ناو ئەو ئایەتەی کە باسمان کرد: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾(ابن القيم)لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووێ:(خودای پەروەردگار لە کتێبەکەی ڕێگای ئیمانداراني بەدرێژی ڕوون کردۆتەوە وە ڕێگای خراپەکارانی بە درێژی ڕوون کردۆتەوە، وە چارەنووسی ئیمانداران بە درێژی، وە چارەنووسی خراپەکاران بە درێژی، وە کارو کردەوەی ئیمانداران، وە کاروکردەوەی خراپەکاران، دۆست و پشتیوانی ئیمانداران، وە دۆست و پشتیوانی خراپەکاران، سەرشۆڕی بۆ خراپەکاران، وە ڕێنموویی بۆ ئیمانداران، ئەو هۆکارانەی کە ئیمانداران بە هۆیەوە ئەم پلەیان بە دەستهێنا، وە ئەو هۆکارانەی کە خراپەکارن بەهۆیەوە سەرشۆڕ بوون، خودا حاڵی هەردوو چینەکەی بە ئەوپەڕی ئاشکرایی ڕوون کردۆتەوە تاوەکو چاوەکان ببینن وەکو چۆن چاوەکان ڕووناکی و تاریکی دەبینن.

بۆیە زانایانی شارەزا لە دینی خوا شارەزان بە ڕێگای ئیمانداران بە ناسینێکی تەواو، وە ڕێگای خراپەکاران دەناسن بە ناسینێکی ئاشکرا، هەردوو ڕێگاکەیان بۆ ڕوون بۆتەوە وەکو کەسی ڕێبوار کە دەزانێت ئەو ڕێگایەی بە مەبەستەکەی دەگەیەنێت کامەیە! وە ئەو ڕێگایەی بەرەو لەناوچوونی دەبات کامەیە!، بۆیە زانایان زاناترین و بەسودترین دروستکراون بۆ خەڵك وە ڕێگانیشاندەر و ڕێنموویی ترین کەسن بۆ بونەوەر، بۆیە هاوەڵانی بەڕێز بەرز و سەرکەوتوون لەهەموو ئەو کەسانەی کە لە دوایانەوە دێن تاوەکو دوارۆژ، چونکە ئەوان لە ناو ڕێگای جاهیلیەت و تاریکی و کوفر گەورەبوون و ئەو ڕێگایانەی بەرەو لەناوچوونیان دەبات بە درێژی شارەزای بوون، پاشان پێغەمبەر(ﷺ)هات بۆ لایان لە ناو ئەو گومڕاییە دەری هێنان بۆ ڕێگای ڕاست و هیدایەت، لە ڕێگا تاریکییە قوڵەکان دەریهێنان بۆ ڕێگای ڕووناکی تەواو، لە

شیرکەوە بۆ یەکتاپەرستی، لە نەزانینەوە بۆ زانین، لە گومڕایی بۆ هیدایەت، لە ستەم بۆ دادپەروەری، لە کوێری بۆ چاوڕۆشنی، هەر بۆیە هاوەڵان نرخ و ڕێزی ئەو دینەیان دەزانی کە ئیمانیان پێهێنابوو، شارەزا و ئاگاداری بوون ، وەدەیانزانی نرخی ئەوەی پێشتر کە لەسەری بوون لە جاهیلیەت چییە و نرخی چەندە ! ، چونکە پێچەوانە جوانی پێچەوانەکەی بەرامبەری دەردەخات، وە شتەکان بە دژەکانیان ڕوون دەبێتەوە بۆیە بەردەوام خۆشەویستی و تامەزرۆییان بۆ دین زیاتر دەبوو، وە ڕق و دژایەتیان بۆ جاهیلییەت و بەرنامەکانی پێشتر زیاد دەبوو.

بەڵام لە دوای هاوەڵان کەسانێك گەورەبوون لە ناو ئیسلام کە زانستیان بە تەواوی بە جاهیلییەت نەبوو، هێندێك بابەتی ڕێگای ئیماندارانیان لەگەڵ ڕێگای خراپەکاران تێکەڵ کرد، بۆیە تێکەڵبوون و هەڵەکردن لە بابەتێك ڕوودەدات بە هۆی لاوازی عیلم و زانست بە هەردوو ڕێگاکە، وەکو ئیمامی عومەر فەرمووی:( إنما تُنقض عُرى الإسلام عروة عروة إذ نَشأ في الإسلام من لا يَعرف الجاهِلية)ئەمە لە ئەوپەڕی زانستی ئیمامی عومەرە چونکە ئەگەر جاهیلیەت وحوکمەکەی نەزانێت کە جاهیلییەت هەموو ئەو شتانەیە کە پێچەوانەن لەگەڵ ئەو شەرعەی کە محمد(ﷺ)هێناویەتی ئەوە لە جاهیلیەتە، دەدرێت پاڵ(الجهل)نەزانین، بۆیە هەموو شتێك پێچەوانەی پێغەمبەر(ﷺ)بێت ئەوە نەزانینە، کەسێك ڕێگای خراپەکاران نەناسێت و بۆی ڕوون نەبوبێتەوە یان گومان و دوودڵ بێت لە هەندێك لە بابەتەکانی ڕێگای خراپەکاران کە پێی وابێت لە ڕێگای ئیماندارانە وەکو ئێستا کە کەوتۆتە ناو ئەو ئوممەتە زۆر لە بوارەکانی بیروباوەڕ و زانست و کارکردن، کە ڕێگای خراپەکاران و کافر و دوژمنانی پێغەمبەرانە کەسانێك خستوویانەتە ناو ئیسلام کە پێیان وابووە ئەمە ئیسلامە و ڕێگای ئیماندارانە)[٢].

[٢] کتاب الفوائد لابن القيم:١٠٨-١٠٩.

مامۆستا سید قطب لە تەفسیری ئایەتەکە دەفەرمووێ:( قورسترین و گرانتریت شت کە ڕێکخراوە ئیسلامییەکان پێوەی ئەنالێنن فێڵ کردن و تێکەڵکرد و ناڕوونییە دەربارەی ئەو بابەت و داواکاریانەی کە لە چوارچێوەر(لا اله الا الله)دەسوڕێنەوە،وە بابەتەکانی خودی ئیسلام لەلایەك، وە بابەتەکانی شیرك و جاهلیەت لەلایەکی تر.

وە قورسترین شت کە ڕێکخراوەکان پێوەی دەنالێنن ڕوون نەبوون و ئاشکرا نەبوونی ڕێگای موسڵمانانە لە ڕێگای کافر و بێ بڕوایان، وە جیاوازبوونی ناوەڕۆك و دەستپێکەکانە، وە تێکەڵکردنی ناو و سیفاتەکان کە بەهۆیەوە جیاوازی ڕێگاکە دیاری ناکرێت!!

بۆیە دوژمنانی کۆمەڵە ئیسلامییەکان زۆر باش ئەم درز و کەلێنە شارەزا بوونە، هەوڵیان بۆ داوە بە تێکەڵکردن و فراوانکردن و قوڵبونەوەی،..تاوەك وای لێهات ئەو کەسەی هەوڵی ڕوون کردنەوەی ئیسلام و جاهیلییەت بدات وەکو تۆمەتێك بدرێت بە نێوچاوانی! کە ئەویش تۆمەتی بە کافرکردنی موسڵمانان!!

وە وای لێهات حوکمی ئیسلام و حوکمی کوفر لەنەریتی خەڵك فەرامۆش کراوە نەوەك بە حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی!

بەڕاستی ئەمە کارەساتێکی گەورەیە...وە ئەمە یەکەم بەربەستە پێویست و حەتمییە کە گشت بانگخوازەکان لە هەموو سەردەمەکان هەوڵی گۆڕینی بدەن!پێویستە خەڵك بانگبکرێت و دەعوە بکرێت بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێگای ئیمانداران لە ڕێگای کافران...وە پێویستە بانگخوازان لە ڕوونکردنەوەی حەق و ڕاستی هیچ نەرمی و گۆڕانی تیا نەبێت، وە هیچ ترس و بیمێکیان نەبێت، وە لۆمەی لۆمەکاران وایان لێنەکات واز لەم بانگەوازییە بێنن، وە قسە و هاورای هیچ کەسێك، سەیریان کەن!ئەوانە موسڵمانان کافر دەکەن!!.

بەڵێ پێویستە بانگخوازان ئەم بەربەستە لەسەر ڕێگا لابەن، وە لەناو خودی خۆیان ئەم ڕوونبونەوەیەی هەردوو ڕێگاکە بە تەواو ڕەگی داکوتابێت، تاوەکو هەموو تواناکانی لە پێناو خوا سەرف بکات و تووشی هیچ گومان و ناڕوونییەك نەبێت وە تووشی هیچ فیلێك نەبێت، وە تووشی هیچ تێکەڵکردنی بابەتەکان نەبێت، چونکە تواناکان بە چالآکی بە کارناخرێت تاوەکو بیروباوەڕی وانەبێت کە ئەوان لەسەر حەق و ڕاستیین و ئیمانداران وە ئەوانەی لە ڕێگاکەیان وەستاون و بوون بە بەربەست لە بەردەم دینی خوا کافر و تاوانبارن،...بەهەمان شێوە ناتوانێت تاڵ و ناخۆشی ڕێی ئەم بانگەوازە هەڵبگرێت تاوەکو دڵنیا نەبێت لەوەی کە ئەمە بابەتی کوفر و ئیمانە، وە کافرەکان لەسەر ڕێگای لادراون، وە ئەوان لەسەر دینێکن و گەلەکەیان لەسەر دینێکە،:﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾[٣].

بەهەمان شێوە جارێکی تر جاهیلیەت گەڕاوەتەوە لە بواری عیبادەت ، وە لە بواری یاسادانان، وە لەبواری دۆستایەتی و دوژمنایەتی، بەڵی جاهیلیەت گەڕاوەتەوە بە بەرگە نوێیەکەی و لە ژێر ناو و دروشمە هەڵخەڵەتێنەرەکان....ڕژێمی جیهانی نوێ....دیموکڕاسییەت.....پەرلەمان....ڕەوشتی گفتوگۆ لەگەڵ تاغووت....تا کۆتایی.

بەڵێ بەڕاستی ئەم دینە بە غەریبی گەڕاوەتەوە وەکو چۆن بە غەریبی دەستی پێکرد جاهیلیەتی شیرکی جیهانی گەڕاوەتەوە بە وێنە و نمایەکی تر بەرامبەر بە یەکتاپەرستی خاڵ بە خاڵ بە شێوازێکی نوێ....ئایا کێن و نایانبینن ئەم نامۆیانەی کە خۆشبەختن بە دوعای پێغەمبەر(ﷺ)بۆیان بە(حسنى): (بدأ هذا الدين غريبًا وسيعود غريبًا كما بدأ ، فطوبى للغرباء) .

---

[٣] في ظلال القران:٢/١١٠٦.

لە پاشان:ئەم کتێبەم دابەش کردووە بەسەر پێشەکی و دەسپێك، وە دوو بەش و کۆتایی.

بەشی یەکەم:بیروباوەڕی جاهیلیەتی سەرەتا:

١-بیروباوەڕی جاهیلیەکانی سەرتا لە بواری عیبادەت.

٢- بیروباوەڕی جاهیلیەکانی سەرتا لە بواری حوکم و یاسادانان.

٣- بیروباوەڕی جاهیلیەکانی سەرتا لە بواری دۆستایەتی و دوژمنایەتی.

بەشی دووەم:بیروباوەڕی جاهیلیەتی ئێستا:

١- بیروباوەڕی جاهیلیەکانی ئێستا لە بواری عیبادەت.

٢- بیروباوەڕی جاهیلیەکانی ئێستا لە بواری حوکم و یاسادانان.

٣- بیروباوەڕی جاهیلیەکانی ئێستا لە بواری دۆستایەتی و دوژمنایەتی.

٤-ئاگادار دواکەوتن و شوێنکەوتن بە.

کۆتایی: لە کۆتایی داو لە خوا دەکەم قەڵەمەکەی دەستم بپارێزێت لە هەڵە و کەم و کورتی، وە هیدایەت و ڕاستیمان پێ ببەخشێت، وە ڕاستی و دڵسۆزی، وە لێمان قبولّ کات.

## بەشی یەکەم:بیروباوەڕی جاهیلییەکانی سەرەتا.

دەسپێك:

پێش چوونە نێو بابەتەکە پێویستە ووشەی(جاهلیة)ڕوون بکەینەوە لە ڕووی زومانەوانی و زاراوەی شەڕعەوە چونکە ئەمە ناوەڕۆکی بابەتەکەمانە:

پێناسەی زاراوەیی: ووشەی(جاهل)ووشەیەکە(اسم فاعل)ە، وەرگیراوە لە(جهل)کە پێچەوانەی(علم)ە، دەوترێ:(جهل الشيء)کاتێك نەزانێت، بەهەمان شێوە(جهل)بەواتای شوێن نەکەوتنی حەق دێت – هەرکەسێك پێچەوانەی حەقی کرد زانا بێت پێی یان نا پێی دەوترێ(جاهل) بۆیە سەلەف وتویانە:(من لم يعْمل بما علم فهو جاهل)واتە:(هەرکەسێك کار بەو زانستە نەکات کە لەلایەتی ئەوە جاهیلە)[٤].

بنچینەی(ج–ھ–ل)لە قورئانی پیرۆز بەم چەند شێوە و دەستەواژە هاتووە:

(تجهلون – يجهلون – الجاهل – الجاهلون -جاهلين – جهولا – بجهالة – الجاهلية) وە ئەم دەستەواژانە بەسێ واتا هاتوون لە قورئان:

–نەبوونی زانیاری بە شتێك(عدم العلم):(يَحسبُهم الجاهِل أغْنياء من التَعفُف)واتە: ئەو کەسەی ئاگاداری حاڵیان نەبێت و وابزانێ دەوڵەمەندن لەکاتێکدا هەژار و نەبونن.

–هەڵە و بێئاگایی(الطيش والسفه):(إنمه التوبة على الله للذين يعملون السوء بجهالة)(جهل) لەم ئایەتە بەمانای ئەو بێئاگایی و تاوانە دێت کە ڕوو لە مرۆڤ دەکات بەهۆی لاوازی ئیمان پاڵی پێوە ئەنێ بۆ هەڵەو تاوان لەکاتێك ئاگادارە و لە پاشان دەگەڕێتەوە.

---

[٤] (ابن منظور: لسان العرب١٢٩/١١، وآلوسي:بلوغ الدب في معرفة أحوال العرب١٧/١ )

–ڕێگا و ڕێچکە(المذهب والطريقة): ئەمە زۆرترینیانە کە لە قورئان بەو مانایە دێت، وە ئەم ووشەیەش لە ڕووی ماناوە دابەش دەبێت بۆ دوو بەش:

یەکەم: لە نێوان پێغەمبەران و گەلەکەیان دا هاتووە زیاتر، وەکو پێغەمبەر نوح کاتێك گفتوگۆی لەگەڵ گەلەکەی دەکرد لە کۆتایی فەرمووی:(ولكِني أراكم قوماً تجْهلون)، یان پێغەمبەر هود کاتێك ڕەددی گەلەکەی داوە و فەرمووی:(ولكني أركم قوماً تجْهلون).

دووەم: لە چەند شوێنێکی دیاریکراو ئەم دەستەواژەیە هاتووە بە شێوەی (فعل المضارع) و (اسم فاعل)، وەکو(يظنون بالله غير الحق ظن الجاهلية) و (أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون) و (ولا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى) و (إذ جعل الذين كفروا في قلوبهم الحمية حمية الجاهلية).

وە پێناسە(الجاهلية)لە ڕووی زاراوەی شەرعەوە(اصطلاحاً)بەم شێوەیە هاتووە:

واتا دورکەوتنەوە لە حەق و زانیاری نەبوون بەرامبەر بەخوا و دینەکەی، وە شوێنکەوتنی ئارەزووەکان، وە گومڕایی و دەرچوون، وە خراپبوونی بۆچوونەکان، بێ ئاگایی و بێ عەقڵی، وە دەمارگیری کە سیفاتێکی جاهیلیە پێچەوانەی ئاکار و ڕەوشتەکانی ئیسلامە.

لێرەدا لە وشەی(الجاهلية) نابێت تەنها مانای تەسکی زوبانەوانی وەرگرین کە تەنها بەمانای نەبوونی زانست و عیلم دێت بەشتێك ، چونکە وەکو دەزانین عەرەبەکانی پێشتر چەندین زانست و هونەری زۆریان لەلا بووە کە مێژوو شاهێدی بۆ داون، لە ناسینی ئەستێرە و مانگ و خۆر و شوێنی دەرچوونیان و ئاوابوونیان، وە ناسینی با و جۆرەکان ، وە ئەو زوبانپاراوییەی کە لە شیعر و دێرە شیعرییەکان بوونی هەبووە لە ناویان، وە ڕۆژئاوای ئێستاش کە لە بواری تەکەنەلۆژیا دەستێکی باڵای، بەڵام هیچ شتێك ڕێگر نییە لەوەی پێیان بوترێ جاهیلییەت[٥].

[٥] (الشرك الجاهلي وآلهة العرب المعبودة قبل الإسلام،للدكتور يحيى شاهي:١٢).

(سيد قطب)دەفەرمووێ:(تێگەیشتن لە جاهیلیەت تەنها بەوەی کە ماوەیەکی کاتی بووە پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ)تێگەیشتنێکی هەڵەیە، بەڵکو جاهیلیەت هەموو ڕێگا و ڕێبازێکە کە بەندایەتی بەندە بۆ بەندە بێت، کە ئەم سیفەتەش لە هەموو ڕێچکە و ڕێبازەکان ئێستادا بوونی هەیە، لە هەموو ڕێچکەکان-بەبێ جیاکاری- مرۆڤەکان چەندین یاسا و دەستوور و بوارەکانی ژیانیان لە مرۆڤەکانی هاوشێوەی خۆیان وەردەگرن کە ئەمە بەهەموو پێکهاتەکانی جاهیلیەتە، جاهیلیەت ئەوەیە کاتێك مرۆڤەکان لەلایەنێك لەلایەنەکان عیبادەت بەندایەتی بۆ یەکتر دەکەن، نەوەك تەنها هێندێك هێندێکی تر بپەرستێت لە غەیری خوا).

مانای جاهیلی تایبەت نییە بەکات و شوێنێکی دیاریکراو یان شوێنێکی دیاریکراو یان گەلێکی دیاریکراو بەڵکو چەند بۆچوون و ئاکارێکی دیاریکراوە کە هەرکاتێك ئەنجامدرا ئەوە جاهیلیەتە بێ دیاریکردنی کات و شوێن و گەل، بۆیە بەم پێورە: نیوەی جاهیلیەتی سەردەم جاهیلیەتن[٦].

## یەکەم: بیروباوەڕی جاهیلیەتی سەرتا لە بواری عیبادەت(النسك):

پێناسەی(النسك)لە ڕووی زوبانەوانی: بریتییە لە عیبادەت و پەرستش، وە هەموو ئەو شتانەیە کە بەندە لە پەروەردگاری نزیك دەکاتەوە، دەوترێ(رجل ناسك)أي:عابد، دەوترێ: نسك-تنسك: واتە:عیبادەتی ئەنجامدا، وە (نسك)و(النسيكة)واتە:قوربانی، دەوترێ: هەرکەسێك فلأن شت و فلأن شت ئەنجامبدات ئەوە(نسك)ی لەسەر واجبە، واتە:خوێنێك بڕێژێت لە مەککە.

پێناسەی(النسك)لە ڕووی زاراوەی شەرع: بریتییە لە پاڕانەوە و قوربانی کردن و پشت بەستن و ترسان و ئومێدبوون بە خوا و گەڕانەوە و خۆشویستن و تەواف کردن و نەزرکردن و گشت ماناکانی تری عیبادەت کە ئەگەر ڕووبکاتە خوا بەو عیبادەتانە ئەوە ئیمانداره، بەڵام ئەگەر یەکێك لەو عیبادەتانە بۆ کەسێکی تر ئەنجام بدات ئەوە هاوبەشدانەرە ئەگەر وا گومانیش ببات کە موسڵمانە.

---

[٦] (رؤيا اسلامية لأحوال العلم المعاصر:محمد قطب)

وه پێویسته(كه ئێمه لەم كتێبه باس له بیروباوەڕی جاهیلیەتی سەرتا دەكەین له بواری عیبادەت)باسی پوختەیەكی گشتی له بیروباوەڕ و بۆچوونەكانیان بكەین دەربارەی بتەكان و ئەو پەرستراوانەی كه بەشێك له عیبادەتەكانیان بۆ دەكرد، وه ڕێژەی بیروباوەڕی ئەو گەله نەزانه دەربارەی بتەكان.

* بتەكان لەلای عەڕەب:

(أصنام) جەمعی (صنم) ە، (صنم) یش به واتای(الوثن) دێت[٧]، كه هەردوو ووشه بەواتای بت و داتاشینی ڕەسم دێت، وەكو له فەرموودە هاتووە:(اللهم لا تجعل قبري وثنا يُعبد)واته:(خودایه گۆڕەكەم نەبێت به بتێك و بپەرسترێت)ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه لەسەر ئەوەی كه بت ئەو شتەیه كه خەڵك لەسەر گۆڕەكان ڕاستەوخۆ داوی لیّ دەكەن، وە(الوثن)بەكاردێت لەسەر هەركەسێك كه مەبەستی له عیبادەتەكان غەیری خوا بێت، ئینجا قەبر بێت یان مەڕقەد یان نزارگا یان جگه لەمانەش، وەكو ابراهیم(خليل الله) فەرمووی:(إنما تعبدون مِن دون الله أوثاناً وتخْلقُونَ إفْكاً) وه وەلاّمدانەوەی گەلەكەی:(قالوا نعْبد أصْناماً فنظلُّ لها عاكِفين) بۆیه به بەڵگەی ئەم ئایەته بۆمان دەركەوت كه(الوثن)بەكاردێت له بری(الأصنام)جگه لەمەش لەو شتانەی له غەیری خوا دەپەرسترێت.

---

[٧] مختار الصحاح.

وە ئەم بتانەی کە بێبڕواکان پەرستوویانە لە بنەڕەتدا گۆڕی پیاوچاکان بووە، وەکو(ابن القیم)دەفەرمووێ:(کاتێك پیاوچاکان مردن کافرەکان لەلای گۆڕەکانیان دەمانەوە، پاشان وێنە و لاشەیان بۆ کێشان، دواتر پاش ماوەیەك و تێپەربوونی کات پەرستیان، بۆیە بەردەوام شەیتان دێت بۆ بن گوێی گۆڕ پەرستەکان، وە بە گوێیان دەچرپێنێ کە دروستکردنی گومەز و مانەوە و اعتیکاف کردن لە خۆشەویستی خاوەن گۆڕ و پێغەمبەران و پیاوچاکانە،وە پاڕانەوە لەخوا لەلایان وەرگیراوە، پاشان شەیتان لەم شێوازە دەیانگوازێتەوە بۆ پاڕانەوە لە خوا بەهۆی ڕێزی پیاوچاکان و گۆڕەکان و سوێند خواردن بەخوا لەسەریان، لەکاتێك خوا زۆر لەمە گەورەترە کە سوێندی لەسەر بخورێ یان داوای لێبکرێت بە هۆی کەسێك، پاشان شەیتان لەم شێوازەش دەیانگوازێتەوە بۆ هاوارکردن و قوربانی کردن بۆ خودی گۆڕەکان و داوای تکاکردن و شەفاعەت لێیان و دروستکردنی گومەز و ڕازاندنەوەیان.

پاشان کە شەیتان ئەمەی لەلا کردن بە عیبادەت، وایان لێ دێت خەڵکیش بانگدەکەن بۆ پەرستنی گۆڕەکان و کردنی گۆڕەکان بە جەژن و شوێنی عیبادەت، وە وا دەزانن کە ئەمە بەسوودترە بۆیان لە دونیا و دواڕۆژ!!

وە هەموو ئەمانەش ئاشکرایە(معلوم بالضرورة) کە پێچەوانەی ئەو دینەیە کە پێغەمبەر(ﷺ)بۆی هاتووە.

* بەناوبانگتریت بتەکانی عەڕەب:

١-اللات: لە بنەڕەتدا پیاوچاکێك بووە کە خورادنی بۆ حاجیانیماڵی خوا ئامادە دەکرد، کاتێك مرد هاوبەشدانەران لەلای گۆڕەکەی مانەوە، لە نزیك بەردێکی چوارگۆشەییە کە بینایان لەسەر دروست کردبوو، وە ئەم بتە لە(طائف)بوو، وە هۆزی(الثقیف)سەرپەرشتیان دەکرد بەشانازییەوە، وەکو کلیلی کەعبە ڕێزی هەبووە کە لەلای قوڕەیش بوو، عەڕەب ئەوپەڕی گەورەییان بۆ ئەم بتە دەردەبڕی تاوەکو گەیشت بەوەی کە منداڵەکانیان ناوبنێن بە(زید اللات)و(تیم اللات).

٢-العزى:دارێك بوو لە نێو خانوویەك دانرابوو کە خانووەکە بەلقی دار خورما داپۆشرابوو، وە شوێنەکەشی لە(واد النخلة)یە لە لای ڕاستی ڕێگای مەککە بۆ عێراق، وە ئافرەتێکی ڕووتی قژ بلاّو لەلای بوو، وە هێندێکیان فەخریان پێوە دەکرد و خۆیان دەدا پاڵی لە شەڕەکان، وە یەکێك بوو لە پەرستراوەکانی قوڕەیش وە ئەوانەی لە شەڕ بوون هاواریان بۆ دەبرد، (زید بن عمر بن نفیل)دەیفەرموو:( فلا العزى أدين ولا أبنتيها)، وە منداڵەکانیان لەخۆشەویستی ئەم بتە ناو دەنا بە(عبدالعزى).

٣-مناة: بتێك بوو لە(المشلل)لە نێوان مەدینە و مەککە، وە لەگەورەیی و ڕێزیان بۆ ئەم بتە تەهلیلیان پێوە دەکرد لە کاتی صەفا و مەڕوا ، وە بتێك بوو بۆ(أوس)و(خزرج)و(غسان)، وە لە بتە هەر کۆنەکانە، وە بەخوای دادوەرەکان ناسرابوو، وە منداڵەکانیان ناو دەنا بە(عبد المناة)و(زید مناة).

٤-الهبل: ئەم بتە لەسەر بیری کەعبە دانرابوو کە (عمرو بن لحي الخزاعي) داینابوو لەسەر وێنەی مرۆڤێك کە دەستی ڕاستەی شکاوە، بۆیە قوڕەیش دەستێکیان لە زێڕ بۆ دروست کردبوو، لەناو جەرگەی کەعبە هاواریان بۆ دەکرد، وە ئەگەر سەرکەوتنێکیان بە دەستهێنابا بە شیعرەوە دەیان ووت:( أعل هبل) واتە:بەرزبێت هوبەل، وە یەکێك بوو لە بتەکانی قوڕەیش کە پەرستوویانە.

٥-ذو الخصلة:ماڵێك بوو لە(خثعم)و(جيلة) كە بتێكی لەناو بوو دەپەرسترا كە پێی دەوترا(الكعبة اليمانية)(الكعبة الشامية)، وە دەكەوێتە(تبالة)لە یەمەن، وە پیاوێكی لە ناو بوو كە فال و قوماری دەگرتەوە، وە هۆزی(دوس)پەرستش و تەوافیان لەلا ئەنجامدەدا و ئافرەتیان لە دەوری كۆدەكردەوە.

٦-**ودّ**: بتێك بوو بۆ(الكلب)لە(دومة الجندل)، **سواع**: بتێك بوو بۆ(هذيل)، **يغوث**: بتێك بوو بۆ هۆزی(المراد) دواتر بۆ هۆزی(بني غطيف)لە ناوچەی(الجرف)لە(سبأ)، **يعوق**: بتێك بوو بۆ(همدان)، **ونسر**: بتێك بوو بۆ(حمير) بوو لە هۆزی(ذي كلاع).

ئەم چوارە ناوی چەند پیاوچاكێك بوون كە لە پێش پێغەمبەر(نوح)ژیاون، كاتێك مردن شەیتان بە گوێی گەلەكەی چرپاند كە وێنەكانیان هەڵواسن لە شوێنی دانیشتنەكانیان وە لەخۆشەویستیان بۆ ئەم پیاوچاكانە منداڵەكانیان بەناوی ئەمانەوە دەنا، سەرەتا نەیان پەرست، دواتر كاتێك ئەم نەوەیە لەناوچوو و نەوەكەی دواتر هات لەنێوان خۆیان وتیان باب و باپیرانمان بەهۆی ئەمانەوە بارانیان بۆ باریوە با ئێمەش داوایان لێبكەین! بەم شێوەیە پەرستیان، ئەم بتانە سەرتا لە ناو گەلی پێغەمبەر(نوح)بوو، پاشان دواتر لە ناو عەرەب بڵاوبۆوە[٨].

٧-الفلس: بتێك بوو بۆ هۆزی(الطي) كە دەیانپەرست و دیاریان بۆ دەبرد و شتیان لەلا بەجێدەهێشت وەكو موتفەڕك و بەرەكەتداری، هەركەسێك دوژمندار بوایە بچووبا بۆ لای ئەم بتە سەلامەت دەبوو، وە هەركەسێكی دەركراو كە گەورەكەی دەریكردووە كە دەهات بەم بتە لەگەورەكەی دەپاڕاوە گەورەكەی ڕێگای پێدەدا و و دەگەڕاوە.

٨-سعد: بتێكە هی(مالك)و(ملكان)لە كوڕانی(كنانة)، وە بەردێكی بەرزە لە كەنارەكانی(جدة).

---

[٨] دواتریش لەناو وڵاتانی عەرەبی بڵاوبۆوە بە شێوازێكر تر ئەگەر ئەم ناوانەشی نەبێت چونكە(العبرة بالحقائق والمعاني وليست بالأسماء والمباني.

٩–ذات أنواط: دارێكی سەوزی گەورەیە، كافرەكانی قورەیش جگە لەوانیش لە عەرەبەكان هەموو ساڵێك دەچن بۆلای و شمشێر و ڕمەكانیان پێوە هەڵدەواسن، وە قوربانی لەلا دەكەن و ڕۆژێك لەلای دەمێننەوە.

١٠–غنم: (زيد بن عمر بن نوفل)دەیپەرست كاتێك بچووك بوو، وە هۆزەكەشی كردبوویانە بتێك و دەیانپەرست.

بەم شێوەیە قورەیش بتەكانیان دەپەرست، وە كار گەیشت بەوەی كە بتێكی گەورەیان لەسەر كەعبە دانابوو، وە لە دەوروبەری كەعبەش نزیكە ٣٦٠بتی لێبوو، وە هێندێكیان ئەستێرەی شیعری و ئەستێرەكانیان دەپەرست[٩].

دووەم: شیرك تەنها لەسەر بنچینەی ئینكاری كردن و بڕوانەبوون بەخوا بنیات نەنراوە:

ئەوەی پێویستە باسی بكەین ئەوەیە كە ڕاست نییە بوترێ شیركی كافرەكانی پێشتر تەنها لەسەر ئینكاری كردنی بوونی خودا بووە، بەڵكو بە پێچەوانەوە ئەم فكرەیە بە گشتی لە ناو مزری هیچ كافرێكی پێشتر نەبووە، بەڵكو ئەم فكرەیە سەری هەڵدا بەهۆی ئەو فكرە بۆش و لاوازەی كە هاتە كایەوە.

بۆیە كافرەكان بڕوایان وابوو كە خودا پەروەردگار گەورە و دروستكاری ئاسمان و زەوییە و بەڕێوەبەرییەتی بە تەنها، وە موڵكی ئاسمان و زەوی هەموو هی ئەوە، بۆیە ئەگەر پرسیاریان لێبكرابا كێ ئاسمان و زەوی دروست كردووە؟دەیانووت:خودایەكی بەدەسەڵات و كارزان دروستی كردووە، وە ئەم بابەتە بابەتێكی گرنگە چونكە خەڵكێكی زۆر پێی وایە ئەگەر كەسێك بزانێت خودا هەیە و دروستكارە ئەوە بووە بە موسڵمانێكی تەواو و ڕاستەقینە!! ئەگەر سەیری قورئان بكەین لە چەندان شوێن خودا ئەم بۆچوونەمان بۆ ڕاست دەكاتەوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾.

[٩] سەیری كتێبی (الأصنام لابن الكليبي) بكە.

بۆیە كافرەكان لە ڕووی بڕوابوونیان بە خوا لەلایەنی(ربوبیة)كێشەیان نەبوو، بەڵام كێشەكەیان ئەوەبوو كاتێك دەیانووت: نابێت ڕاستەوخۆ داوا لە خوا بكرێت پێویستە ناوەند و پەیوەندێك هەبێت چونكە مرۆڤەكان تاوانبارن و شایستەی ئەوە نین ڕاستەوخۆ داوا لە خوا بكەن، ئەم بۆچوونەشیان لە بەراوردكردنی ژیانی خۆیان هێنابوو كاتێك گەورە و دەسەڵاتدارێك پێویستی بە ناوبەند و سكرتێرێك هەبوو بۆ گەیشتن پێی، بۆیە هاتن ئەم ناوەند و واستەیان بەگەورەدانا و عیبادەتیان بۆ ئەنجامدا بە مەبەستی ئەوەی تكایان بۆ بكات لەلای خوا، وەكو خوا دەفەرمووێ: ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾یان ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ ﴾، (قتادة) لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووێ:(كاتێك پێیان بوترێ پەروەردگارتان كێیە؟وە دروستكاری ئێوە كێیە؟ وە دروستكاری ئاسمان و زەوی كێییە؟وە كێ باران لە ئاسمانەوە دەبارێنێت؟دەڵێن: الله، وە پێیان دەوترێ:ئەی مانای چییە ئێوە عیبادەت بۆ ئەو بتانە ئەنجام دەدەن!! دەڵێن: بۆ ئەوەی لە خوامان نزیك كەنەوە و تكامان بۆ بكەن لەلای خوا)[١٠] بۆیە ئایەت لەم بوارە ئێجگار زۆرە

وە ئەگەر سەیری وتەی هێندێك لە شاعیرەكانیان بكەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە ئەوان بڕوایەكی تەواویان بە خوا هەبووە، وەك:

وتەی شاعیر(زهير بن أبي سلمى):

فلا تكتمن الله ما في نفوسكم ليخفى ومهما يكتم الله يعلم

يؤخر فيوضع في كتاب فيدخر ليوم الحساب أو يعجل فينتقم[١١]

وە وتەی(عنتر):

يا عبل أين من المنية مهرب إن كان ربي في السماء قضاها

---

[١٠] فتح القدير للشوكاني:٤/٤٤٩

[١١] (تفسير ابن كثير:٢/٤٥٢)

وه تاوەکو هێندێکیان بڕوایان بە ڕۆژی زیندوبوونەوەش هەبووە کە ڕۆژێك دەمرن و دواتر زیندوو دەکرێنەوە و لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، ئەوەتا(جريبة الأشيم الأزدي)لەکاتی سەرەمەرگدا وەصییەتی کوڕەکەی دەکات و دەڵێت:

يا سعد إما أهلكن فإنني أوصيك إن أخا الوصاة الأقرب

لا تتركن أباك يعثر را جلا في الحشر يصرع لليدين وينكب

واحمل أباك على بعير صالح وأبغ المطية إنه أضرب

و لعل لي مما تركت مطية في الحشر أركبها إذا قيل اركبوا

سێیەم:بێ بنەمابوونی بیروباوەڕی شیرك لەلای موشریکەکانی عەرەب:

ئەوە کەسەی لێکۆڵینەوە بکات لە بنچینە و بنەماکانی جاهیلییەت بۆی دەردەکەوێت کە بنچینە و بنەمایەکی پووچ و لاوازی هەیە بەشێوەیەکی ئاسان دەتوانرێ ڕەددی لێ بدرێتەوە و بۆ خەڵك ڕوون بکرێتەوە،چونکە وەك وتراوە:(ما بني على الباطل فهو باطل)واتە:(هەرشتێك لەسەر باتڵ بنیات نرێ باتڵە)، بۆیە کافرەکان کاتێك ئەو بت و دار و بەردانەیان دەپەرست دەیانزانی کە ئەمانە تەنها دار و بەردێکی داتاشراون بەڵام بەهۆی شوێنکەوتن و دەست گرتن بە نەریتی باب و باپیرانیان دەست بەرداری پەرستن و شوێنکەوتنی نەدەبوون، بۆیە لە هێندێك کات کافرەکان جوێن و ڕقی خۆیان بۆ بتەکان دەربڕیوە، ئەوەتا (امرء القيس) لەگەڵ بتەکەی(ذو الخصلة)کاتێك ویستی هێرش بکاتە سەر(بني أسد)چوو بۆلای بتەکەی تیروپشکی لەلا کرد سێ جاران کە دەری دەهێنا ڕێگری لێدەکرد، بۆیە توڕە بوو گۆزەکەی شکاند و بە ڕووی بتەکەی کێشا و ووتی:خۆت و باوکت لە ناوچن، دواتر هێرشی کردە سەر(بن اسد)بەسەریاندا زاڵ بوو.

بەهەمان شێوە کاتێك یەکێك لە ئەندامەکانی هۆزی(بني كنانة) کە (مالك)و(ملكان)بوون کاتێك بتێکیان هەبوو لە کەنارەکانی(جدة)پێی دەوترا(سعد) ئەم پیاوە بە حوشترەکەیەوە چوو بۆ لای ئەم بتە و وەستا لە پێشی وەکو بەرەکەتییەك بۆ ئەم بتە، کاتێك لێی نزیك بووەوە فلما أدناها منه نفرت منه ، فذهبت في كل وجه وتفرقت عليه ، فتناول حجرًا فرماه به ، و قال لا بارك الله فيك إلهًا !!! نفرت علي إبلي ! ثم خرج في طلبها حتى جمعها وانصرف عنه وهو يقول: أتينا إلى سعد ليجمع شملنا فشتتنا سعد فلا نحن من سعد

وهل سعد إلا صخرة بتنوفة من الأرض لا يدعى لغي ولا رشد

وكذلك ما حدث عند صنم لطيء يقال له الفلس ، وذلك أن رجً لا سرق ناقة امرأة من كلب من بني علم ، وكانت جارةلمالك بن كلثوم ، فخرج في إثره ، فادركه وهو عند الفلس والناقة موقوفة عند الفلس ، فقال له خ ّلي سبيل ناقة جارتي ! فقال : إنها لربك قال : خلي سبيلها ، قال : أتخفر إلهك ؟ فبرأ له الرمح فح ّ ل عقالها وانصرف ا مالك ، وأقبل السادن على الفلس ونظر إلى مالك ورفع يده وقال : وهو يشير بيده إليه:

يارب إن مالك بن كلثوم اخفرك اليوم بناب يملكوم

وكنت قبل اليوم غير منشوم

يحرضه عليه ، وعدي بن حاتم يومئذ قد عتر عنده وجلس هو ونفر معه يتحدثون بما صنع مالك ، فقال عدي بن حاتم : انظروا ما يصيبه في يومه هذا فمضت له أيام لم يصبه شيء ، فرفض عدي عبادة الأصنام و تنصر ، فلم يزل متنصرًا حتى جاء الله بالإسلام فأسلم

وهكذا لا يتورع العربي الجاهلي عن أكلها - أي الآلهة – وخصوصًا إذا كانت مصنوعة من التمر أو الزبيب إذا أضر به الجوع كما وإنه لا يحجم أبدًا عن سرقتها وأخذ اللبن المخصص لها ، وهذا ما فعله مالك بن حارثة الأجداري يوم أن شرب اللبن المخصص لسقاية الصنم ود ولعل بعضهم ينصرف عن عبادة الحجر القديم إذا ما وجد أن ثمة حجرًا آخر هو أكثر نضارة وأحدث عهدًا ، تمامًا كما فعل الحارث بن قيس.

أجل إنما هي عاطفة دينية واهية لا تستند إلى أساس عقلي ، ولعل في هذا البيت الشعري الآتي من قصيدة بشر بن أبي حازم ، ما يدل بما فيه الكفاية على افت عقيدة المشركين ووهنها ، وعلى ضعف آلهتهم التي لم تستطع أن تدافع عن نفسها ، ولم تقو على غائلة الثعالب ، التي ما كان يحلو لها أن تخرج فضلاا وأبوالها إلا عند أقدام ورؤس تلك الآلهة.

إله يبول الثعلبان برأسه      لقد ضل من بالت عليه الثعالب

بەهەمان شێوەی چیرۆکی(عمرو بن الجموع)لەگەڵ بتەکەی، کە ئەم ڕووداوە بووە هۆی موسڵمانبوونی، لەو کاتەی بینی بتەکەی لەناوەڕاستی بیرەکە کەوتووە، ووتی:سوێند بەخوا ئەگەر خوا بویتایە خۆت و ئەم سەگە لە ناوەڕاستی بیرەکە نەدەبوون.

چوارەم:ئەو عیبادەتانەی کە جاهیلەکان بۆ خوا درۆینەکانیان ئەنجام داوە:

پوختەی عیبادەتەکان دەگرێتەوە کە لەسەرەتا باسمان کرد کە هاوبەشدانەران ئەنجامیان داوە بۆ بتەکان لە پاڕانەوە و داوای منداڵ و شیفا و بەرکەت ، بەڵام دەبێ ئەمەش بزانین کە ئەم عیبادەتانەیان تەنها لە حاڵەتی خۆشی و ئاسایی ئەنجامداوە،بە پێچەوانەوە لە کاتی ناخۆشی بتەکانیان لە یاد نەماوە و تەنها لە خوا پاڕاونەتەوە، وەکو خوای گەورە باسی هاوبەشدانەران دەکات کاتێك سواری کەشتی دەبوون: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ وە لە ئایەتێکی تر ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ * ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴾. بە پێچەوانەی ڕۆژگاری ئێستامان کە هاوبەشدانەران لە کاتی خۆشی و ناخۆشی هاواری پەرستراوەکانیان دەکەن بەڵکو لەکاتی ناخۆشی زیاتر ئومێدیان بە پەرستراوەکانیان هەیە نەوەك خودا (سادەترین نموونە لەکاتی ڕۆیشتن بە ڕێگا کە پێی هەڵئەخلیسکێ دەڵێت:یا حەزرەتی غەوس کە مەبەستیان پێی(عبدالقادر گەیلانی)یە).

وه له عیبادهتهکانی تریان دهزو و چاوهزارایان ههڵدهواسی، وه سوێندنیان به باب و باپیرانیان دهخوارد، وه سوێندیان به بتهکانی لات و عوزا دهخوارد له گهورهیی و ڕێزیان بۆی، وه سیحرو جادو و ههواڵدهری غهیب لهناویان زۆر بڵاوبوو، تاوهکو کهسێك که بهتهواویش له بواری ههواڵدانی غهیب شارهزا نهبوو ههواڵی دهدا به خهڵك بۆ بهدهستهێنانی بڕێك پاره.

وه قوربانیان لهلای بتهکان دهکرد و دهمانهوه لهلایان، وه چهکهکانیان پێوه ههڵدهواسی وهکو بهرهکهتییهك بۆئهوهی سهرکهوتنیان بۆ بێت، وه بتهکانیان بهگهوره دادهنا و دهپاڕانهوه لێی، وه له خۆشهویستیان بۆ بتهکان ناوی منداڵهکانیان به ناوی بتهکان ناو دهنا، وهك(عبدالمناة)(عبداللات) وه نهزریان لهلا دهکردن، وهگشت شێوهکانی تری عیبادهت.

پێنجهم:ئهو عیبادهتانهی که جاهیلیهکان بۆ خوا ئهنجامیان دهدا:

١-نوێژ: له هۆزی(غفار)کهسێك ههبوو بهناوی(أبو ذر الغفاري)پێش ئهوهی بگات به پێغهمبهر(ﷺ) ماوهی سێ ساڵ نوێژی دهکرد بۆ خوا، نوێژی عیشای له کۆتایی شهو دهکرد ئینجا پاڵ دهکهوت تاوهکو ڕۆژ ههڵدههات، دواتر بوو به هاوهڵی پێغهمبهر(ﷺ)[١٢].

٢-بهڕۆژووبون:کافرهکان له ڕۆژی عاشورا بهڕۆژی دهبوون، وهکو لهفهرمووده هاتووه له دایه عائشه(كان يوم عاشوراء تصومه قريش في الجاهلية....)[١٣] واته:(ڕۆژی عاشورا ئهو ڕۆژه بوو که قورهیش له جاهیلیهتدا تیایدا به ڕۆژودهبوو.....).

٣-مانهوه له مزگهوت به مهبهستی عیبادهت(الإعتكاف): جاهیلیهکان له(مسجد الحرام)شهوێك یان زیاتر دهمانهوه، وه مانهوه له مزگهوت به عیبادهتێکی گهوره دهژمێردرا لهلایان، وهکو له ئیمامی عومهرهوه هاتووه که فهرموویهتی:(وتم:ئهی پێغهمبهری خوا(ﷺ)من نهزرم کردووه له جاهیلیهت که له مزگهوت بمێنمهوه؟ فهرمانی کرد که وهفا به نهزرهکهی بکات).

---

[١٢] صحيح السيرة النبوية:محمد بن رزق طرهوني:١/٧٧.

[١٣] (فتح الباري:٤/٢٤٤)

٤- حەجکردن: ئەمە یەکەم دروشم بووە لەلای عەرەب، حەجیان ئەنجامدەدا وەکو حەجی موسڵمانان، وە زیارەتکردنی کەعبە لەلایان بە دووجۆر بوو:

یەکەم:زیارەتکردنی عەمرە لە هەرکاتێك جگە لە مانگی حەج، چونکە پێیان وابوو عومرە کردن لە مانگی حەج لە تاوانە هەرە گەورەکانە.

دووەم:زیارەتکردنی ماڵی خوا لە مانگی حەج، وە نابێت حەج و عومرە پێکەوە ئەنجام بدرێت.

وە هاوبەشدانەران لە عەرەفە دەوستان تەنها قورەیش نەبێت کە لە (مزدلفة) لەلای (مشعر الحرام) دەوەستان، وە تەوافیان دەکرد لە صەفا و مەروا، وە پرچ تاشین و کورتکردنەوە لە نیشانەی ئیحرام بەستن بوو لەلایان پاش ئەنجامدانی دروشمەکان، وە کەعبەیان بە گەورە دادەنا بە پۆشینی بەرگێکی نوێ، کە ڕۆژی عاشوڕایان دیاریکردبوو بۆ نوێکردنەوەی پۆشاکی کەعبە، وە پێیان وابوو کە دوعا کردن لەلای کەعبە وەرگیراوە، وە خواردن ونانیان دەدا بە حاجیانی ماڵی خوا ، وە حەرەمیان زۆر بەگەورە دادەنا، وەکو لە چیرۆکی(خبیب)هاتووە کاتێك لە حەرەم دەریان کرد بۆ(تنعیم)ئینجا کوشتیان-خوا بیان کوژێت-پێان وابوو ئەمە لە گەورەدانانی حەرەمە کە نابێ خوێنی تێدا برێژرێ، وە کەسێك لە جاهیلیەت ئەگەر کەسێکی کوشتبا دەچووە ناو حەرەم، کوڕی کوژراوەکە یان باوکی کوژراوەکە ئەم کەسەی دەیبینی و هێرشی نەدەکردە سەر چونکە هەرکەسێك بچێت بۆ ناو حەرەم ئەوە پارێزراو دەبێت ، وە مانگە حەرامکراوەکانیان بە گەورە دادەنا، کاتێك مانگی(رجب)دەهات دەیان ووت:(منصل الأسنة)، هیچ تیر و ڕمێکیان نەدەهاوێشت.

بۆیە زۆر جوان (شاطبي)باسیان دەکات و دەفەرمووێ:(جیاوازیان دەکرد لە نێوان ژن مارەکردن و داوێن پیسی، وەتەلاقدانیان هەبوو، وە تەوافی ماڵی خوایان دەکرد، وە دەستیان بە بەردە ڕەشەکەدا دەهێنا، وە هاتوچۆیان دەکرد لە نێوان صەفا و مەروا، وە(الله أكبر)یان دەکرد و دەوستان لەسەر کێوی عەرەفە، وە دەچوون بۆ موزدەلیفە، وە شەیتانیان ڕەجم دەکرد، وە مانگە حەڕامکراوەکانیان بە گەورە دادەناو شەڕیان تێدا حەڕام دەکرد، وە خۆیان

له جه‌نابه‌ت ده‌شوشت، وه‌ مردووه‌كانیان ده‌شوشت و كفنیان ده‌كرد، وه‌ نوێژیان له‌سه‌ر ده‌كرد، وه‌ ده‌ستی دزیان ده‌بڕی، وه‌ ڕێگره‌كانیان له‌ دارده‌دا، جگه‌ له‌مانه‌ش له‌و شتانه‌ی كه‌ له‌ پێغه‌مبه‌ر ابراهیم ەوه‌ بۆیان مابوو)[١٤]

باشه‌ ئه‌گه‌ر هاوبه‌شدانه‌ران ئه‌و هه‌موو دروشمه‌ ئیسلامیه‌ له‌ناویاندابێت كه‌چی سوودیان پێنه‌گه‌یه‌نێت و پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) جه‌نگ و جیهادیان له‌گه‌ڵ بكات و به‌كافر له‌ قه‌ڵه‌میان بدات ئه‌بێ حاڵی ئه‌و كه‌سانه‌ چۆن بێت كه‌ به‌رده‌وام دژایه‌تی خوا و به‌رنامه‌كه‌ی ده‌كه‌ن و حوكم و یاسایه‌ك دێنن كه‌ پێچه‌وانه‌ی قورئان و دینی ئیسلامه‌ ! ! !

له‌ پاشان:ئه‌ی خوێنه‌ر باش بزانه‌ كه‌ ئیسلام روبه‌ڕووی بێ ئیمانی و ئیلحاد نه‌بۆته‌وه‌ له‌گه‌ڵ جاهیلیه‌كانی سه‌ره‌تا، به‌ڵكو ئێستا و به‌رده‌وامیش ڕووبه‌ڕوی لادان و دوركه‌وتنه‌وه‌ له‌ دروشمه‌كانی په‌رستن بۆ غه‌یری خوا له‌گه‌ڵ خوا به‌ مه‌به‌ستی نزیك بوونه‌وه‌ و شه‌فاعه‌ت ده‌بێته‌وه‌ ! ! به‌ڵێ ڕووبه‌ڕوی ئه‌و لادانه‌ بۆته‌وه‌ له‌ وه‌رگرتنی شه‌رع و یاسای مرۆڤ له‌ مرۆڤه‌كانی هاوشێوه‌ی خۆی له‌ نموونه‌ی حه‌ڵاڵكردن و حه‌رامكردن، خودا ده‌فه‌رمووێ :﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ ﴾. ئا ئه‌مه‌ دووبنچینه‌ی سه‌ره‌كیه‌ له‌ شیرك كه‌ له‌هه‌موو سه‌رده‌م و شوێنێك هه‌یه‌ كه‌ ئه‌وانیش:

یه‌كه‌م:عیباده‌تكردنی غه‌یری خوا له‌گه‌ڵ خوا.

دووه‌م:حه‌لاڵكردن و حه‌رامكردن–دانانی ته‌شریع و یاسا –له‌ غه‌یری به‌رنامه‌ی خوا، یان وه‌رگرتنی ده‌ستوور له‌ لایه‌ن غه‌یری خواوه‌.

كه‌ له‌رۆژگاری ئێستامان خۆی له‌ گۆڕپه‌رست و كۆشك په‌رسته‌كان ده‌بینێته‌وه‌(عباد القبور)و(عباد القصور)، خودا له‌ هه‌ردوو جۆر بمانپارێزێ.

---

[١٤] (الموافقات للشاطبي:١/١٧٥)

### دووەم: بیروباوەڕی جاهیلیەکانی سەرتا لە بواری حوکم و یاسادانان[15]:

کاتێك ئێمە باسی حوکم و تەشریع دەکەین وەباسی ئەو کەسانە دەکەین  کە دینی ئیسلامیات گۆڕیوە بەدانانی یاسا و حوکمەکانیان، پێویستە لە سەرەتادا باسی(الطاغوت)بکەین، تاوەکو بابەتەکە تێکەڵ نەبێت و کەسێك وا گومان نەبات(الطاغوت)تەنها بریتییە لە شەیتان! بەتایبەتی کاتێك ئێمە باس لە بیروباوەڕی جاهیلیەکانی سەرەتا دەکەین، وە بۆ ئەوەی بابەتەکە ئاسان بێت لەسەرمان بۆ ئاشکراکردن و زانینی ئا ئەو بت و تاغوتانەی کە دینی خوایان گۆڕیوە لە جاهیلیەتی ڕۆژگاری  ئێستاماندا .

خودا دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴾ خودا گشت پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی بە گەلەکەیان بڵێن:کە تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە عیبادەتکردنی تاغووتەکان، یان لە ئایەتێکی تر ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾خودا لەم ئایەتە کردوویەتیە مەرجی دەستگرتن بە دینی ئیسلام کە دەبێت سەرەتا کوفر بە تاغوت بکرێت دواتر ئیمان بهینرێ بە خوا،  وە لە ئایەتێکی تر ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴾ لەم ئایەتەش مەرجی موژدە بۆ ئیمانداران بەستراوەتەوە بە دوورکەوتنەوە لە پەرستنی تاغووتەکان وە گەڕانەوە بۆ لای خوا.

---

[15] وتراوە: ووشەی یاسا لە(یاسق)ەکەی (جەنگیز خان)ەوە هاتووە، کە بەفارسی پێی ئەوترێ(یاساغ)، وەکو(ابن كثير)باس لە(یاسق) دەکات و دەفەرمووێ:(کتێبێك بوو  حوکمەکانی تەورات و ئینجیل و قورئان و هەواو ئارەزووی خۆیان تێدا کۆکردبوەوە)، وە دەفەرمووێ:(هەرکەسێك بڕوا بەم کتێبە بکات و کاری پێبکات ئەوە لە بازنەی ئیسلام دەرچووە). ئەمەش ڕەددانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن:یاسا داهێنراوەکان چەندین بابەتی لە شەرعەوە وەرگیراوە، هەمان شێوەی(یاسق)ەکەی جەنگیز خان کە حوکمی چەندین بابەتی لە شەرع وەرگیرابوو، بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لە بەردەم کافرکردن و بەکافرداناني ئەو کەسەی کە کاری پێدەکات.

الطاغوت: لەڕووی زوبانەوانی لە چاوگی (طغيان)ەوە هاتووە کە بەواتای(مجاوزة الحد)لە سنور دەرچوون دێت، وەکو خوای گەورە کاتێك باسی پێغەمبەر نوح دەکات دەفەرمووێ:(إنا لَمَّا طَغَى الماءُ حَمَلناكُم في الجارِيةِ)واتە:(کاتێك ئاوەکە لە سنور دەرچوو(پێغەمبەر نوح و ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون) سواری کەشتیەکەمان کردن).

وە لەڕووی زاراوەی شەرعیەوەش پێناسەی زۆری بۆ کراوە گشتگیرترین پێناسە پێناسەکەی(ابن القيم)ە کە دەفەرمووێ:(الطاغوت كل ما تجاوز به الحد من معبود أو متبوع أو مطاع فالطاغوت كل قوم يتحاكمون...)واتە:( هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بەندە زیادەڕۆیی دەکات لە پەرستراوی و شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی، وە تاغووت هەموو کەسێکە کە حوکمی بۆلا دەکرێت لە غەیری خوا و پێغەمبەرەکەی، یان بپەرسترێ جگە لەخوا، یان شوێن شتێك بکەوێت بۆ غەیری خوا، یان گوێڕایەڵی بکرێت لە غەیری خوا).

وە گەورەی ڕاڤەکارانی قورئان (طبري) دەفەرمووێ:(ڕای پەسەند لەلای من دەربارەی تاغوت هەموو شتێکە کە لەسنوور دەرچووبێت و بپەرسترێت لە غەیری خوا، ئینجا یان بە ڕەزامەندی کەسەکە بێت کە دەیپەرستێت، یان بە گوێڕایەڵی کەسێك بێت کە دەیپەرستێت ئینجا جیاوازی نییە پەرستراوێك بێت یان بتێك یان شەیتانێك یان هەرشتێکی تر....).

کەواتە مەبەست بە تاغووت هەموو تاکێك یان کۆمەڵێك یان ڕێکخراوێکە کە دەرچێت و لاملی بکات لەسەر خوا، وە سنوری بەندایەتی ببەزێنێت، وە بانگەشەی سیفاتی خوایەتی و دەسەلأتداری بۆ خۆی بکات، پاشان فەرمانەکانی جێبەجێبکرێت لەسەر زەوی، وە وا لە خەڵك بکات فەرمانەکانی جێبەجێبکەن ئینجا بە زۆری بێت یان بە فریودان یان بە ڕێگای فێربوونی گومڕایی.

ملکەچبوونی کەسێك بۆ ئەم دەسەلأت و حوکمانە پەرستنە و دواتر گوێڕایەڵییە بۆی– کە هەموو ئەمانە عیبادەتن بەبێ هیچ گومانێك–بۆ تاغووتەکان.

شێخ (محمد حامد الفقی) دەفەرمووێ:(پوختەی ووتەی پێشێن و سەلەف ئەوەیە کە تاغووت هەر شتێکە کە بەندەی موسڵمان بۆ خوای ئەنجام دەدات لە دڵسۆزی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی بۆ کەسێکی تر ئەنجام بدرێ ئینجا شەیتان بێت لە جنۆکە و مرۆڤەکان یان دار و بەرد بێت یان جگە لەمانەش، وە ئەو یاسا و دەستورە بیانی و دانراوانەی کە لە بڕی حوکم و یاسای خوا دانراون بێ هیچ گومانێك دەچێتە ژێر مانای تاغووت، وە هەموو ئەو یاسایانەی کە دانراون بۆ حوکم کردن لە بوارەکانی خوێن و نامووس و موڵك کە پێچەوانەن لەگەڵ شەرع و یاسای خوا لە گشت بوارەکان، لە جێبەجێکردنی سزاکان و حەرامکردنی ڕیبا و زینا جگە لەمانەش کە ئەم یاسا دەستکردانە بە حەڵاڵ و ڕێپدراوی لە قەڵەم دەدەن، خودی ئەم یاسایانە تاغوتن، وە دانەر و بڵاوکەرەوەی ئەم یاسایانەش تاغووتن، وە هاوشێوەی ئەم یاسایانە هەموو ئەو کتێبانەی کە بە عەقڵ و هەوا و ئارەزوو دانراوە بۆ ئەوەی پێچەوانەی ئەو ڕاستییە بکات کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)هێناویەتی، ئینجا بە مەبەستەوە بێت یان بێ مەبەست ئەوە تاغووتە).

یەکەم:یاسا تاغوتییەکان لەلای هاوبەشدانەرانی عەرەب:

زۆر کەس وا گومان دەبات سەرەتای بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ هاوبەشدانەران لەسەر شیرکی مردووی گۆڕەکان بووە، لەو سەردەمەدا هیچ جۆرە تاغوتێکی زیندوو نەبووە کە یاسا و تەشریعی دانابێت و دینی باوکمان(ابراهیم)ی گۆڕی بێت، بۆیە لەم بابەتە هێندێك نموونە دەهێنینەوە لە تاغووتانی پێشتر کە یاسا و تەشریعیان داناوە، حەڵاڵەکانی پەروەردگاریان حەرام کردووە و حەرامەکانیان حەڵاڵ کردووە تاوەکو ئەو ناڕۆشنییە و تێکەڵکردنە لابچێت کە دەدرێتە پاڵ ئیسلام، کەوابوو کەسێك کە یاسا و دەستورێك دابنێت بۆ خەڵك ئەوە لە بازنەی ئیسلام دەچێتەدەر، چەند نموونەیەك، چونکە وەك دەوترێ(بالمثال يتضح المقال)واتە:(بە نموونە قسەکان ڕوون دەبێتەوە):

(ابن الهشام)له کتێبی(السیرة)باس دەکات:(کە –عمري کوڕی لحي– چوو بۆ(مأرب)لە(بلقاء)کە لەو کاتەدا عەمالیقەکان لەو شوێنە بوون، بینی خەڵکەکەی بت ئەپەرستن، پرسیاری دەربارەی کرد، پێیان ووت:ئەمانە ئەو بتانەن کە ئێمە دەیان پەرستین، داوای بارانیان لێ ئەکەین بارانمان بۆ ئەباریێ، داوای سەرکەوتنیان لێ دەکەین سەردەکەوین، پێی وتن:باشە ئێوەش بتێکم نادەنێ بۆ ئەوەی بیبەمەوە بۆ دوورگەی عەرەب و بیپەرستن؟! بتێکیان دا پێی کە پێی دەوترا(هبل) هێنای بۆ مەککە و داینا، وە فەرمانی بە خەڵك کرد کە بیپەرستن و بەگەورەی دابنێن([16]) لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە:(عەرەب(عمر بن لحي)یەیان کردبوو بە خوایەك کە هەرشتێکی دابهێنابایە دەبوو بە شەریعەت و یاسا لەناویان).

وە لە شوێنێکی تر هاتووە:(کە–قصي بن کعب بن لؤي–دەسەلاَتێکی وا زۆری هەبوو کە هەموو گەلەکەی گوێڕایەڵیان بۆ دەکرد،وە هەموو ڕێز و خۆشەویستی مەککەی بەدەستهێنابوو، لە کاتی ژیانیدا فەرمانی لەناو هەموو قورەیش کاری پێدەکرا، وە لە دوای مردنیش فەرمانەکانی وەکو قەرزێك وابوو لەسەر گەردەنی خەڵك).

وە بەهەمان شێوە(جنادة بن عوف بن أمیة الکناني):(کە مەراسیمێکی لە هەموو ساڵێك ئەنجام دەدا، وە پێی دەوترا(أبا ثمامة)، وە بە دەنگی بەرز دەیووت: ئاگادار بن(أبا ثمامة)وتەکانی وەلاَم دەدرێتەوە و ڕەخنەی لێ ناگیرێ، ئاگادار بن فلانە ساڵی یەکەم حەلاَڵە، گشت خەڵك حەلاَڵیان دەکرد، وە فلاَنە ساڵ حەڕامە، هەموو خەڵك حەڕامیان دەکرد)[17]

بەهەمان شێوە(مالك بن نضلة الجشمي)پێش موسڵمانبوونی، وە هۆزەکەی کە(غفار)بوو، مانگە حەڕامەکانیان حەلاَڵ دەکرد، وە حەلاَکراوەکانی خودایان حەڕام دەکرد.

وە ئەم جۆرەی حەڵاڵکردن و حەڕامکردنە بە(نسيء)ناوی هاتووە لە قوڕئان کە خودا باسی لێوە دەکات: ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ ......﴾.

---

[16] (سیرة ابن هشام:٧٩/١)

[17] (صحیح السیرة:٩٦/١).

دووەم:بەشێك لە و یاسا و تەشریعانەی کە لە جاهیلیەتی سەرەتا بوونی هەبوو:

١-﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ ﴾

٢-﴿ وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنۡعَٰمٞ وَحَرۡثٌ حِجۡرٞ لَّا يَطۡعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ ﴾

٣-﴿وَأَنۡعَٰمٌ حُرِّمَتۡ ظُهُورُهَا وَأَنۡعَٰمٞ لَّا يَذۡكُرُونَ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا ٱفۡتِرَآءً عَلَيۡهِۚ ﴾

٤-﴿ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ ﴾

٥-سیب السوائب: (السائبة)ئەو حوشترەیە کە نەزرکراوە بۆ بتەکان، بۆیە هیچی لێ سوار ناکرێ، وە خورییەکەی بەکارناهێنرێ، وە شیری نادۆشرێ تەنها بۆ میوان نەبێت، لە(أبي روق)و(السدي) هاتووە:(کە کاتێك کەسێك کارەکانی بە حوشترەکەی جێبەجێ دەکرد دواتر حوشترەکەی یان شتێکی تری لە ماڵەکەی بۆ بت و تاغووتەکان دەکرد بە(السائبة)و نەزر).

٦-بحروا البحائر:(البحيرة)ئەو حوشترەیە کە کونێکی گەورەیان لە گوێچکەکانی دەکرد، وە کاتێك ئەمەیان ئەنجامدەدا کە حوشترەکە پێنج زگی بوایە و پێنجەمیان مێینە بوایە.

٧- وصلوا الوصائل: (الوصيلة)ئەو مەڕەیە کە دوو مێینەی لەسەریەك دەبێت.

٨-حاموا الحمائم: والحمي هو فحل الضراب أي التلقيح ، قيل إذا أتم ضراب عشرة أبطن قالوا:حمى ظهره، وتركوه أي للطواغيت،لا يحملون عليه شيئًا.

خودای گەورە لە ڕەدانەوەی ئەم یاسایانەی کە دایان نابوو دەفەرمووێ: ﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴾.

بەڵێ ئا ئەو تاغووت و یاسادانەرانە بەهەمان شێوە هاتبوون وەکو گەورە و دەسەڵاتدارێکی خەڵك دایان نابوو کە دەبێت خەڵك لە بەشێك لە بەروبوومی کێڵگە و مەڕوماڵات کە بەدەستیان دەکەوێت  بۆ پەرستراوەکانیان بەجێبهێڵن، وە منداڵەکانیان لە کاتی هەژاری بکوژن، وە

کچەکانیان لە ترسی ئابڕو و شەرەف زیندە بەچاڵ بکەن، وە خەڵکیش گوێڕایەڵیان دەکرد و پێی ڕازی بوون، وەکو خودا دەفەرمووێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ قَتۡلَ أَوۡلَٰدِهِمۡ شُرَكَآؤُهُمۡ لِيُرۡدُوهُمۡ وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡۖ ﴾ ، وە خوای گەورە هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە دەڵێن:ئەمە حەلاڵە و ئەمە حەرامە دەفەرمووێ : ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ ﴾.

بۆیە هەرکەسێك بانگەشەی مافی یاسا و دەستور دانان بۆ خۆی بکات، مافی حەلاڵکردن و حەرامکردن (بەمانا کوردیەکی ڕیپیدان و قەدەغەکردن)، مافی دانانی شێوازی ژیان و دەستوور بۆ مرۆڤەکان ئەوە خۆی کردووە بە هاوبەشی خودا و لە دینی ئیسلام دەرچووە و کافربووە، ئەگەر وا گومانیش بات کە موسڵمانە!! خوا دەفەرمووێ:﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ ﴾لەم ئایەتە خودا ئەو کەسانەی بەهاوبەشدانەر دانا کە یاسا و دەستوور دادەنێن لە غەیری بەرنامەی خوا، وە ئەو کەسانەی گوێڕایەڵی ئەو کەسانەش بن کە حەلاڵ و حەرامەکانیان گۆڕیوە ئەوە خودا بە هاوبەشدانەر ناویان دەبات، وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ﴾.

سێیەم:دادوەری کردن لەلای عەرەب:

دادوەری واتە:دوو لایەنی دوژمن و کێشەدار کەسێك وەکو دادوەر هەڵبژێرن بۆ یەکلایکردنەوەی کێشە و سکالاکانیان وەهەردوولاش بە حوکم و فەرمانەکەی ڕازی بن[18]

وە شتێکی سروشتی بوو کە لە نێوان ئەندامانی هۆزێك یان دووهۆز کێشە سەری هەڵدابا و گەڕابانەوە بۆلای دادوەرەکان و چارەسەریان کردبا، لێرەدا دەگونجێ هەموومان پرسیار بکەین و بڵێین: لەو سەردەمەدا هیچ یاسا و دەستور و حکومەتێك نەبووە! وە هیچ سەباز و پۆلیسێك نەبووە! وە هیچ دادروەرێك نەبووە! باشە کە ئەمانە نەبێت چ لایەنێك هەڵساوە بە یەکلای کردنەوەی کێشەکانیان؟

[18] راجع القاموس الفقهي لغة واصطلاحا، لسعيد أبو حبيب:٩٦.

بەدڵنیاییەوە لەو کاتیش چەندین یاسا و دەستوور هەبوە بۆ حوکم کردن لە نێوان دوولایەنی دژ بەیەك، وە پاشان چەند کەسێکیان هەبووە کە هەڵساوە بەم کارە کە وەك دادوەر و قازی ئێستا وابوون! وەکو ئەندام پەرلەمان و سەرۆکی ولآت وابوون! وە بەبێ هیچ گومانێك ئەمانە بەشێك بوونە لە تاغووت کە ئێمەی موسڵمان فەرمانمان پێکراوە کە کوفری پێ بکەین: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ یان ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ یان ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ فَبَشِّرۡ عِبَادِ﴾ ئینجا با سەیری رۆژگاری خۆمان بکەین بزانین چەند کەس ئەم سیفەتانەی لە خۆ هێناوەتەجێ!!

لە کتێبی(الأغاني)هاتووە کە(أكثم بن صيفي)یەکێك بووە لە داوەر و قازیەکانی عەرەب، واتا عەرەب بەحوکمەکانی ڕازی بوونە و لە هەموو دورگەی عەرەب وەکو دادوەرێك سەیریان کردووە.

وە بەهەمان شێوە دەربارەی(عامر بن الظرب)کە یەکێکە لە حاکم و دادوەرانی عەرەب، هاووێنەی نەبووە لەناو عەرەب لە تێگەیشتن و دەرکردنی حوکم و یاساکان.

چونکە دابەشکردنی کار و پیشەکان شتێکی بڵاوبووە لەناو عەرەب هەموو خێزانێکی گەورەی عەرەب کەسێکیان دەستنیشان دەکردو و وەکو گەورە و مەرجەعێك دایان دەنا، وە قورەیش لە کاتی کێشە و ململانێکان دەگەڕانەوە بۆ لای ئەمان، هەندێك لەو کەسانەی کە بەناوبانگ بوونە بە دەرکردنی حوکم و یاسا–کە وەکو حاکمە تاغووتەکانی ئێستا وابوون– لە پێش هاتنی ئیسلام ئەمانەن بوون:

حاجب بن زرارة، الأقرع بن حابس[19]، وربيعة بن مخاشن[20]، وضمرة بن ضمرة[21]، وغيلان بن سلمة[22]، وعبد المطلب، وأبو طالب[23]، والعاص بن وائل[24]، والعلاء بن حارثة[25] ، وربيعة بن حذار لبني أسد، ويعمر بن الشداخ ،وسلمى بن نوفل لبني كنانة[26]

---

[19] عەرەب پێشبڕکێیان دەکرد بۆ ئەوەی حوکمیان بۆ بکات لە نێوانیان.

بۆیە بێ هیچ گومانێك عەرەب دادوەر و دەسەڵاتداری هەبووە کە حوکم و کێشەکانیان بۆلای بردۆتەوە، ئینجا هێندێك لەو دادوەرانە ناوخۆیی بوون تەنها کێشەی هۆزەکەی خۆی چارەسەر کردووە، وە هێندێکیان دەرەکی بوون و دادوەریان لە نێوان هەموو عەرەب کردوە، وە گشت عەرەبیش بە حوکمەکەی ڕازیبوونە[27].

بەڵام شێوازی حوکم و یاساکەیان:

هەموو هۆزێك کورسی و شوێنێکی هەبوو لە جاهیلیەت–وەکو پەرلەمانی ئێستا–وە شێوازەی حوکم و دانانی یاسا و دەستوورەکە بەم شێوە بوو کە سەرکردە و گەورەکان لە شوێنێك کۆدەبوونەوە ئەوشتەی کە پێیان وابوو سوود و کڵکی هەیە بە پێی هەوا و ئارەزووەکانیان حوکمێکیان بۆی دەردەکرد، ئینجا مەرج نەبووە لە شوێنێك هەموو گەورەکان پێکەوە کۆببنەوە لە یەك کات، هێندێك کات یەك کەس حوکمەکەی دەردەکرد لە بازاڕ یان لەماڵەوە

---

[20] یەکێکە لە حاکمەکانی هۆزی تمیم، کە لە بۆنەکان لەسەر کورسیەك دادەنیشت کە لە دار دروستکرابوو لەناو گومەزێك پێی دەوترا(ذا الأعواد)حوکمی بۆ خەڵك دەکرد، وە باوکیش هەر حاکم بووە.

[21] یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی(بنی تمیم)لە جاهلییەت.

[22] لە پیاوماقوڵانی(بني ثقیف)ە لە بۆنەکان دادەنیشت ڕۆژێك حوکمی دەکرد، وە ڕۆژێکی تر شیعری دەخوێندەوە.

[23] ناوی(عبد مناف بن عبدالمطلب)کە یەکێکە لە پیاوە گەورە و حاکمەکانی قورەیش.

[24] یەکێکە لە پیاوەکانی(بنی سهم)، وە یەکێك بوولە حاکمەکانی قورەیش لە جاهیلیەت.

[25] هاوپەیمانی(بنی زهرة)بوو، وە یەکێك بوو لە دادوەرەکان، وە خەڵك خۆشیان دەویست.

[26] یەکێکە لە پیاوماقوڵ و حاکمەکانی(کنانة)یە، وە شاعیرێك دەربارەی دەڵێت:

بل السید المذکور سلمی بن نوفل یسود أقوامًا ولیسوا بسادة.

[27] (راجع أسواق العرب:١٠١–١٠٤)

یان له شوێنێکی گشتی و دەیزانی که هیچ یەکێك له حاکمەکانی هاوڕێی پێچەوانەی نییه و هەموویان هەمان ئەم بۆچوونەیان هەیە[٢٨].

وه ئەو کەسانەی که یاسا و حوکمیان دەردەکرد بریتی بوون له دەسەڵاتدار و سەرکرده و گەورەکان که گشتیان تاغووتی شوێنی جیاواز بوون–وەکو حاڵی سەردەمی ئێستامان–وه خاوەن قسه و دەسەڵات بوون، وه خەڵکیش به گشتی گوێڕایەڵ و ملکەچ دەبوون وەکو ڕێزێك بوو یان له ترسان، یان بەهۆی دەستکەوتنی سوود و قازانجێکی کاش!!

## سێیەم: بیروباوەڕی جاهیلیەکانی سەرتا له بواری دۆستایەتی و دوژمنایەتی:

ماناى(الولاء):

الولاء:خۆشەویستی و سەرخستن و ڕێز له نێوان دوو کەسی خۆشەویست له ڕووکەشی و ناوەڕۆك.

ماناى(البراء):

البراء:دووری و ڕقلێبوونەوه و دوژمنایەتییه له دوای ئاگادارکردنەوه.

(شیخ الإسلام ابن تیمیة)دەفەرمووێ:(ولاء پێچەوانەی براءه، وه بنچینەی ولاء بەواتای خۆشەویستی و نزیکی دێت، وه بنچینەی براء یش به واتای ڕقلێبوونەوه و دووری دێت)[٢٩]

[٢٨] وەکو ڕۆژگاری ئێستا که هێندێك کات ئەندام پەرلەمانان یاسایەك دەردەکەن، کەسێك یان دوو کەس بەشداری نەکردووه له دەرکردنی یاساکه بەڵام هەمان حوکمی ئەمانی هەیه، چونکه وەکو ئەو بنەماییەی که زانایان دایانناوه دەفەرموون:(الرضا بالکفر کفر) واته:(ڕازیبوون به کوفر کوفره).

[٢٩] راجع کتاب الولاء والبراء للدکتور:محمد سعید القحطان93 .

وە بیروباوەڕ جاهیلیەکانی سەرەتا لە بوار دۆستایەتی و دوژمنایەتی بەو شێوە بووە:

شتێکی ئاشکرایە کە کۆمەڵگای جاهیلی لە کۆمەڵێك هۆز و تیرە پێك هاتبوو، وە هەموو هۆزێك گەورەیەکی هەبوو، وە ئەو گەورەیە مەرجەعی خەڵك بوو لەکاتەکانی شەڕ و ئاشتەوایی، کوڕان و ئەندامانی ئەم هۆزە دەگەڕانەوە بۆلای گەورەکەیان، وە ئەو گەورەیەش پیشەی بەڕێوەبردنی کاروباری هۆزەکەی بوو ، وە گرنگترین سیفات و ڕەوشت لەناو جاهیلیەکان کە کەسێك دەبوو  بە گەورە و سەرکردە  سیفاتەکانی: ئازایەتی و بەخشندەیی و ڕێز و بەهاناوە هاتن و پاك داوێنی و جگە لەمانەش لە ڕەوشتە جوانەکان[٣٠].

بۆیە ئەگەر سەیری کۆمەڵگای جاهیلی بکەین دەبینین پێوەری سەرەکی لەلایان هۆز و تیرە بوو، بەهۆی ئەو پێوەرە خەڵك بەرگری لە نەفس وماڵی خۆی دەکرد، واتا هۆکاری کۆکردنەوەی ئەندامانی هۆزێك و ئامادەکرنیان پەیوەندی بە خزمایەتی و نەسەب هەبوو، کەواتە هەر تیر و هۆزەیەك حکومەتێکی سەربەخۆ بووە و ئەندامەکانی گوێڕایەڵبوونەوە و بڕیار و حوکمەکانیان وەرگرتووە بەبێ هیچ ڕخنە و دوودڵیەك، بۆیە هەموو تایبەتمەندی دەوڵەتبوون لەناو هۆزەکان بوونی هەبووە تەنها دیاریکردنی سنوور نەبێت، بۆیە کۆمەڵگای جاهیلی مانای دەوڵەتبوونی لە مانای تیر وهۆزە کورتکردۆتەوە و دوستایەتی تەنها بۆ هۆزەکەی خۆی بووە.

وە هیچ دەستوور و نوسراوێکیان نەبوو کاری پێبکەن مەگەر ئەو نەریتە کۆنانەی کە لە باب و باپیرانییەوە بۆیان بەجێمابوو، بۆیە خەڵکەکە زۆر بەتوندی دەستیان پێوە دەگرت و وەکو دین سەیریان دەکرد لە هەموو ژیانی ڕۆژانەیان کاریان پێدەکرد ئەگەر پێچەوانەی حەقیش بوایە، وەکو یەکێکیان دەڵێت:

وما أنا إلا من غزية إن غوت ***غويت وإن ترشد غزية أرشد!!

---

[٣٠] (سەیری سیفاتی سەرکردە و دەسەلاّتدارانی ڕۆژگاری ئێستا بکە... باخوێنەر خۆی تێبینی لەسەر بدات)

بۆیە دۆستایەتی و دوژمنایەتی بەو شێوەبوو، هۆز و تیرەکانیان وەك بتێك دانابوو، نیشتیمان و خاك وەك بتێك وابوو لەلایان، دارو بەردیان وەك بتێك دانابوو، وەهەواو ئارەزوەکانیان کردبوو بە بتێك، وە گەورە و سەرکردەکانیان وەك بتێك وابوو لەلایان، تا وای لێهات لە پێناو ئەمانە شەڕ و کوشتار بەرپادەکرا، وە لەپێناو ئەمانەش ئاشتەوایی دەکرا، دۆستایەتی و دوژمنایەتی، دووری و نزیکی، لەسەر ئەم پێوەر و تێگەیشتنە کەمەی ولاء و براء بنیات نرابوو لەلایان[٣١].

ئەگەر تووشی سەرسوڕمان بووی لە حاڵی جاهیلەکان لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ئاستی کۆمەلآیەتی ئەوە سەیری حاڵی خەڵکی ڕۆژگاری ئێستا بکە، دەبینی هەمان ئەو شتانەی کە لە جاهیلیەتی سەرەتا بوونی هەبوو ئێستاش هەیە، لەو کاتەدا بڵێ:سبحان الله!ما أشبه الليل بالبارحة!! ئای دوێنێ شەو چەند بەم شەو دەچێت.

---

[٣١] بەهەمان شێوەی ڕۆژگاری ئێستامان خۆشەویستی نیشتیمان و خاك بووە بە بتێك ڕۆژانە خەڵك ئەیپەرستێ، وە زۆر کەسیش بەناوی ئیسلامەوە بە درۆ خەڵك بۆ ئەم فکرە بۆگەنە بانگدەکات بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە (حب الوطن من الإيمان)واتە:(خۆشەویستی نیشتیمان لە ئیمانەوەیە)کە ئەم فورمودەی بنچینە و بنەمای نییە لە ئیسلام و هەڵبەستراوە، بەڵکو خۆشەویستی خاك ئەو کاتە ئەبێت بە عیبادەت کە خاکێك بێت حوکمی ئیسلامی تێدا جێبەجێبکرێ.

## بەشی دووەم:بیروباوەڕی جاهیلیەتی ئێستا:

### یەکەم: بیروباوەڕی جاهیلەکانی ئێستا لە بواری عیبادەت:

١- بت و پەرستراوەکان لە جاهیلیەتی ئێستا:

گرنك ئەوەنییە کە بت و پەرستراوەکان لە سەردەمی ئێستا لەسەر شێوازی دار و بەردی داتاشراو بێت، بەڵکو بتەکان هێندێك کات گۆڕێکە یان گومەزێکە یان ڕێبازێکی لادراوە لە دینی ئیسلام، یان ڕێچکەیەکی پێچەوانەیە لە گەڵ بیروباوەڕی موسڵمانان، وە بۆ گشت ئەم بتانە چەندان جۆری عیبادەت ئەنجامدەدرێ کە دەبێت تەنها بۆ خوا ئەنجام بدرێت.

زانای پایە بەرز(عبدالرحمن السعدی)دەفەرمووێ:(بت: ناوێکی گشتییە بۆ هەموو شتێك کە لە غەیری خوا دەپەرسترێ، وە جیاوازی نییە ئەو بتە دارێك بێت یان بەردێك یان گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان بێت لەم بوارە، کە عیابەدەتکردنی غەیری خوایە، بۆیە هەرکەسێك هاوار لە غەیری خوا بکات و بیپەرستێت ئەوە کردوویەتی بە بت و بەم کارەی لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە، وە خۆدانەپاڵی بۆ ئیسلام سودی پێناگەیەنێ، چەندین کەس هەن کە خۆیان دەدەن پاڵ ئیسلام لە کاتێك کافر و دووڕون و بێدینن، بۆیە عیبرەت بە ڕوح و بنچینەی دینەکەیە، نەوەك تەنها ناو و شێوازێك بێت کە بنچینەی نەبێت)[٣٢].

وە شێخ(محمد بن عبدالوهاب)لە کتێبی(التوحید) لە ژێر بابی(ئەو بەڵگانەی هاتوونە دەربارەی زیادەڕۆیی لە گۆڕی پیاوچاکان کە دەبێتە بتێك لە غەیری خوا و دەپەرسترێ) دەفەرمووێ: (....دووەم:زیادەڕۆیی لە زۆر کات دەبێتە بە عیبادەت ، سێیەم:هەرشتێك بپەرسترێ دەبێت بە بت ئەگەر گۆڕی پیاوچاکانیش بێت، چوارەم:أوثان:ئەو پەرستراوانەن کە وێنەیان نییە، وەکو گۆڕ و دار و بەرد و گومەزە کە پێشتر باسمان کرد، وە وتراوە:(وثن) واتا (صنم)،وە (صنم)واتا(وثن) بەڵام ئەم وتەیە ڕاست نییە تەنها ئەگەر لە دووشوێنی جیاواز بە تەنیا بێن، ئەوە یەکێکیان مانای ئەوەی تر هەڵدەگرێ، بەڵام لە کاتی بە یەك گەیشتن لە یەك ئایەت هەریەکێکیان بە مانایەك دێت).

[٣٢] (راجع القول السديد في مقاصد التوحيد:للعلامة عبد الرحمن السعدي ٧١-٧٢)

مەبەستی شێخ ئەو بنچینەیەیە کە زانایان دەربارەی چەند ووشەیك دایان ناوە دەفەرموون:(إذا جتمعا افترقا، وإذا افترقا إجتمعا)واتە:(ئەگەر کۆببنەوە لەیەك شوێن ئەوە مانایان جیاوازە، وە ئەگەر بە جیا لە شوێنێك بێن ئەوە لەمانادا کۆدەبنەوە) وەکو وشەکانی(اله)و(رب)، وە(الفقير)و(المسكين)جگە لەمانەش.

باسی ئەو بتانەمان کرد کە لە جاهیلیەتی سەرەتا دەپەرسترا، وە باسمان کرد کە پیاوچاکان دوای مردنیان لەلایەن جاهیل و بیّ بڕواکانەوە پەرستراوە.

وە لەم بەشەدا باسی ئەو بتانە دەکەین کە لەسەردەمی ئێستاماندا دەپەرستریّ، وەکو چەند نموونەیەك تاوەکو دورکەوینەوە لە عیبادەتی غەیری خوا ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ﴾ .

گرنگترین ئەو بتانەی کە لەسەردەمی ئێستادا بوونی هەیە و دەپەرستریّ:

١–لە میصر:گۆڕی(سيد)البدوي، گۆڕی(سيدة)زينب، گۆڕی ئیمام شافیعی، گۆڕی(سيدة)نفيسه، گۆڕی حسین، تا کۆتایی.

٢– لە سودان: گۆڕی(سيد)الحسن، گۆڕی(ست مريم)، گۆڕی(شيخ فرح ود تكتوك)، گۆڕی(شێخ أبو جنزير)، گۆڕی(سيد)هاشم...

٣–لە لیبیا: گۆڕی (سيدي عبدالسلام الاسمر)، گۆڕی (سيدى رافع)، گۆڕی (سيدي مرعي)، گۆڕی (سيدي سعد)، گۆڕی(رويفع الأنصاري)......

٤– لە سوریا:گۆڕی پێغەمبەری خوا(زكريا)،گۆڕی پێغەمبەری خوا(يحيى)، گۆڕی(سيدة)زينب، گۆڕی(خالد بن الوليد)....

٥–لە عێراق: گۆڕی(على بن أبي طالب)، گۆڕی(عبدالقادر گەیلانی)، گۆڕی(أحمد الرفاعي)، گۆڕی(الحسين)، گۆڕی(أبو حنيفة).....

٦–لە ئەفغانستان: گۆڕی(عبدالأنصاري)، گۆڕی(مهتر لام)، گۆڕی(علي بن أبي طالب)!، گومەزی(موي مبارك)واتا مووی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ).

٧-له پاکستان: گۆڕی(بیر بابا)و(کوتا قبر)و(بري امام)، وه گۆڕی(داتا دربان)، وه گۆڕی(سلطان الباهو).

بۆیه دهبینین له ههر ولاّتێك گۆڕێك پهرستراوه و عیبادهتی بۆ ئهنجامدراوه، تهنها خاکی(حجان)نهبێت که هیچ گۆڕ و گومهزی لیّ نییه بپهرستریّ، بهلاّم نابێت ئهمهشمان لهیاد بچیّ که چهندین جۆری تری بت و شیرکی لێیه که ترسناکتره لهمه که له بهشهکانی داهاتوو باسی لێوه دهکهین.

٢- بیروباوهڕی فیرقهکان دهربارهی ئهو بتانهی که باسمان کرد:

أ:بیروباوهڕیان بهوهی که پێغهمبهران و شێخهکان غهیب دهزانن:

بهڵگه لهسهر ئهمه له(جواهر)هاتووه له کتێبی(تیجانییهکان[٣٣]) که هاتووه :(له گهورهیی(أحمد تیجاني) ئهلیت : ئهو پله نزیکه و شارهزاییهی که به پهروهرگار ههیبوو، وه ئهو فیراسهته نورییهی که بههۆیهوه حاڵی هاوهڵانی بۆ ئاشکرابوو، وه جگه لهمانهش له دهرخستنی شته شاراوهکان و ههواڵدان به بابهته غهیبیهکان، وه زانیاری به کۆتایی کارهکان، وه سهرنجامی چاکه و خراپهی کردهوهکان، وه جگه لهمانهش له کارهکانی ڕۆژانه)[٣٤].

وه هاتووه:(پێویسته لهسهر فێرخواز بیروباوهڕی وابێت که شهیخهکهی ههموو شتهکانی دهبینیّ، وهکو چۆن ئهو له پهنجهرهوه شتهکان ئهبینیّ)[٣٥].

---

[٣٣] تیجانییهکان:گروپێکی سهر به ڕێبازی سۆفیگهرین، ههڵگرانی ئهم ڕێبازه باوهڕیان به بۆچوون و بیروباوهڕی سۆفیگهریهت ههیه له (وحدة الوجود)، بڕوابوونیان به(فناء)، وه بڕوایان وایه که شهیخهکانیان غهیب دهزانن چهندین شتی تر که پێچهوانهی بیروباوهڕی ئههلی سوننهیه، وه دامهزرێنهری ئهم ڕێچکهیه(أبو العباس أحمد بن محمد بن المختار بن أحمد بن محمد سالم التجانی) که له نێوان ساڵهکانی(١١٥٠-١٢٣٠هـ)( ١٧٣٧ _ ١٨١٥م )ژیاوه، که له گوندی(عين ماضي)له گوندهکانی سهحرای جهزائر له دایك بووه، وه بهناوبانگترین کتێبیشیان(جواهر المعاني وبلوغ الأماني في فيض سيدي أبي العباس التجاني)ه .

[٣٤] (الجواهر:٦٣/١)

[٣٥] (رماح حزب الرحيم في نحور حزب الرجيم:٢٨/١).

وە هاتووە:(لە ئاشکرا بوونی شتەکان بۆ شێخ، کە بە واتای هەواڵدان بە شتێك کە ڕووی نەداوە دواتر بەهەمان شێوە ڕوودەدات کە باس کراوە، زۆر جار هەواڵی داوە بەشتێك کە دوای وەفاتی هاتۆتە جێ، ئینجا یان بە ئاشکرا ئەم شتەی باس کردووە یان بە ئاماژە)[٣٦].

وە لە هەندێك لە شێخەکانی(الرفاعية)[٣٧] هاتووە:( (سيدي حمزة)پیاوێکی زۆر پلە بەرز و بەڕێزە، هەرکەسێك پێویستی بە شتێك هەیە با ڕۆژی چوارشەمان ڕووی تێبکات و بچێت بۆ لای چونکە پەڕاوەکانی پەروەردگارییەتی لەلای ئامادە دەبێت لەم ڕۆژە وە پێویستییەکانی جێبەجێدەکرێ؟!)[٣٨]

وە دەڵێن:( (سيدي شيخ المنصور) بەردەوام لە ئاسمان بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی هەیە وەکو سەرچاوەی ئاو لە حەوزێك، ، پێویستی خەڵك جێبەجێدەکات، وە پێویستی نەوەکان و هاوڕێکانی جێبەجێدەکات)[٣٩].

وە هاتووە:( (شيخ بهاء الدين الرفاعي)قسەی کردووە دەربارەی خەتەرەکانی ناودڵی هاوڕێکان و قوتابیەکانی).

وە لە کتێبی(بريلولية)هاتووە–کە یەکێکە لە گەورەترین لقەکانی صۆفی لە پاکستان و هیند و ئەفغانستان– کە هاواری شێخ گەیلانی دەکات و دەڵێت:(ئەی ئەو کەسەی بە هاناوەهاتنت زۆر گەورەیە، بەدیارکەوتووی بۆ گەورە و بچووك، وە تۆ پێویستیەکانی ناو سینەی خەڵك دەزانی)[٤٠].

---

[٣٦] (بغية المستفيد:٢٤٩)

[٣٧] رفاعية:ڕێچکەیەکی سەر بە سۆفیگەرییە، شوێنکەوتوانی لە عیراق و مصر و سوریا و ڕۆئاوای ئاسیا بلاوبوونەتەوە، ئالایەکیان هەیە ڕەنگی ڕەشە کەبەم ئالایە لەهەموو ڕێچکەکانی تری سۆفیگەری جیادەبنەوە، وە ناوەکەی دراوەتە پاڵ(أحمد بن على الرفاعى)کە فەقیهێکی شافعی مەزهەبە(٥١٢هـ–٥٧٨هـ)، وە نازناوەکانی(أبو العلمين)و(شيخ الطرائق)و(شيخ الكبير)و(أستاذ الجماعة)ی پێ وتراوە.

[٣٨] (لە کتێبی ڕیفاعییەکان کە بەناوی قلادة الجواهر:١٩٩)

[٣٩] (خزانة الإمداد في إظهار الغوث الكبير السجاد مولانا عز الدين أحمد الصياد: ١٧١)

[٤٠] (باغ فروس، أيوب رضوي البريلوي:٤٠)

وەهاتووە:(پێغەمبەری خوا(ﷺ) حاڵی هەموو کەسێك و دروستکراوێکی دەزانی و هیچ شتێکی نهێنی لەلای شاراوە نییە)[٤١].

ب—کردنی گۆڕی پیاوچاکان بەهۆکاری نزیکبوونەوە لە خوا:

لە ڕێچکەی(الرفاعية)هاتووە:( کە أحمد الرفاعي پاڕانەوەکانی وەرگیراوە، وە ئارامییە بۆ ترساوەکان، وە بەڕێوەبەری گەردوونە)[٤٢].

وەأحمد الرفاعي(پەناگە و هیوای ئێمەیە، موژدەدەر و ترسێنەری ئێمەیە، دەسەلاّتداری نیعمەتەکانی ئێمەیە، لابەری ناخۆشی و ئازارەکانمانە، وە پەیوەست بوون بە گۆڕەکەی هۆکاری سەرکەوتنە، بەهۆیەوە خوا بەلاّ و ناخۆشییەکان لائەبات، باران ئەبارێنێت، ڕەحم بە دروستکراوەکان دەکات، زەوی بە بەرەکەت دەکات، کشتوکاڵ بەرەو پێش دەچێت، وە بەهۆیەوە بەرەکەتەکان دائەبەزێت و پلەکان بەرز دەبێتەوە)[٤٣].

لە هێندێکیان لە وەسفی(رفاعي) هاتووە:

یارفاعي وقعت في أعتابك     فتدارك عبدًا يلوذ ببابك

يارفاعي يا غوث كل البرايا     لا تضيع طفلا الرجا بك

أنت غوث الوجود مفتاح كتر     الوجود والخير سمح من ميزانك

أنت باب الرسول من غير شك     وأتينا نرجوا العطاء من بابك

وأنا عبدك الذي باعتقاد     علقت رضاه في أثوابك

وتذكر تشريفي بانتسابك     فتحرك بهمة وأغثني

---

[٤١] (تسكين الخواطر في مسألة الحاضر والناظر ،لأحمد سعيد الكاظمي بريلوي:٦٥)

[٤٢] (قلادة الجواهر:٢٤٧)

[٤٣] (الفخر المخلد:٣، القواعد المرعية:٣٨)

يارفاعي وقعت في أعتابك رضي الله عنك أدرك فإني[44]

له هێندێكی تریانەوە هاتووە:

الأحمديون للإسلام أركان وفوا العهود وأشعاف الحمى صانوا

بهم أشد على الأخطار مقتحمًا لا السم سم ولا النيران نيران

بهم تفرج عن ذي النون غمته وفاز نوح ولم يمسه طوفان

عش طيب الأمن ما يستجير بهم فما عليك لصرف الدهر عدوان

ذاك الكبير أبو العباس أحمدهم له على ملكوت الله إيوان

هذا أبو العلمين ال....حجتنا في يوم لا يعرف الخلان[45]

له كاتێك خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ﴾

وە لە هێندێكی تریان هاتووە:

لك ياغوثاه تصرف الزمان حيث أنت المرتجى في كل آن

أنت في بابك محراب الأمان فتداركني وأصلح سببي وأغث إنني في تعب[46]

پاك وبێگەردی بۆ خوا لەكاتێك فەرموویەتی: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ رِزۡقٗا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴾

---

[44] (روضة الناظرين:١١٠)

[45] (قلادة الجواهر:٢٣٣-٢٣٤)

[46] (ديوان الفيض المحمدي)

وه هاتووه:

الله والنبي وهذا الغوث　　حصنًا عن الجبال الرواسي

ناداه لن تراع وأبشر إذا ما　　قلت غوثاه يا أبا العباس

وأنت أرحم من لاذ المسيئ به　　وخير من يرتجى إن جدت الكرب[٤٧].

وه هاتووه:

من لاذ بينا اكتفى عن غيرنا أبدًا　　وجاء في ركبنا بالأمن من ندم

فالجأ بأعتاب عزتي والتمس مددي　　وطف ببابي وقف مستمطرًا نعمي

ولازم الذل في شطئ مترلنا　　تنجو بهمتنا من حالة العدم[٤٨]

خوا دهفهرمووێ: ﴿ قُلِ ٱدْعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴾.

وه هاتووه:

لذ بباب الجليل الرفاعي　　ولك الأمن من ملم الدواعي

وتململ برحبه فحماه حرم　　صل قاطع ال نقطاع[٤٩]

له(بريلولية)[٥٠]هاتووه:(خودا چەند بەندانێکی تایبەت کردووە بە پێویستیەکانی خەڵك، بەهانای پێویستیەکانی خەڵکەوە دەچن)[٥١].

---

[٤٧] (الأمن والعلى:للبريلوي:٢٩)

[٤٨] (رسالة حياة الموات:للبريلوي:٣٠٠/٤)

[٤٩] (الأمن والعلى:١٣)

[٥٠] بريلولية:ڕێچکەیەکی سۆفیگەریە لەسەر مەزهەبی ئیمامی أبو حنیفەن، سەریان هەڵدا لە نیمچە دورگەی هیند لە شاری(بریلی)لەسەردەمانی داگیرکاری بەریتانی، وە بەوە بەناوبانگن کە پێغەمبەران و

لەکاتێك خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ ﴾

وە لەم کتێبە هاتووە:(هاوارکردن و بەهانەوە هاتن لە غەیری خوا دروستە و هاندراوە، هیچ کەس ئینکاری ناکات تەنها کەسێکی خۆبەگەورەزان نەبێت یان کەسێکی عیناد)[52].

وە لە کتێبی(الأمن والعلی)دەڵێن:

ناد عليًا مظهر العجائب     تجده عونًا لك في النوائب

كل هم وغم سينجلي     بولايتك يا علي يا علي[53]

وە دەڵێن:شێخ(عبدالقادر گەیلانی)فەرموویەتی:(هەرکەس هاوارم بۆ بێنێ لەناو ناخۆشیەك ئەوە لەسەری لادەبەم، وە هەرکەس بانگم بکا لەناخۆشییەك وەڵامی دەدەمەوە، وە هەرکەسێك بانگم بکات بەناوی خۆم لەناو ناخۆشیەکی زۆر لەسەری لادەبەم، وە هەرکەس بمکات بە ناوەندێك بۆ لای خوا پێویستیەکانی جێبەجێدەکەم)[54].

وە موشریکێکی تر هاواری عبدالقادر گەیلانی دەکات و دەڵێت:

أيدركني ضيم و أنت ذخيرتي     وأُظلم في الدنيا وأنت نصيري

وعار على حامى الحمى وهو منجدي     إذا ضاع في البيداء عقال بعيري[55]

---

پیاوچاکانیان خۆشدەوێ بەگشتی، وە پێغەمبەریش(ﷺ) بە تایبەتی، وە ئەم ڕێچکەیە دراوەتە پاڵ(أحمد رضا خان تقي علي خان) (١٢٧٢ـ١٣٤٠ هـ – ١٨٦٥ـ١٩٢١م) کە لە(برلی)لەدایك بووە و نازناوی(عبدالمصفي)ی هەڵبژاردووە بۆخۆی، وە لەلای باوکی(تقی علی خان)قوتابی بووە، ئەم ڕێچکەیە کۆمەڵێك بیروباوەڕیان هەیە کە پێچەوانەی ئەهلی سوننەیە وەك:پێیان وایە پێغەمبەر گەردوون بەڕێوە دەبات، چەندین بۆچوونی تر.

[51] (فتاوى أفريقية للبريلوي:٦٢)

[52] (جاء الحق،لمفتي البريلوية، أحمد بار:٢٠٠)

[53] (حياة الموات:٤/٣٠٠).

[54] (مجموعة رسائل رضوية، للبريلوي:١/١٨١)

[55] (راجع كتاب حدائق بخشش ، للبريلوي:٢٦–١٢٥–١٢٦)

وه كەسێكی تر كە هاواری بۆ دەكرێ(أحمد زروق)ە، لە(قصيدة)كەی دەڵێت:

أنا لمريدي جامع لشتاته          إذا ما سطا جور الزمان بنكبة

وإن كنت في ضيق وكرب و وحشة          فناديا بيا زروق آت بسرعة.

خودا دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ * إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٍ ﴾

وه دەربارەی(سيد البدوي)[٥٦] دەڵێن:وتوویەتی:(هەركەس پێویستییەكی هەیە بێت بۆ لای گۆڕەكەم و داوای پێویستییەكەم لێبكات، ئەوە پێویستییەكەی بۆ جێبەجێدەكەم)[٥٧].

وه موشریكێكی تر دەڵێت:(شێخ عبدالقادر بەڕێوەبەری گەردوونە، مۆڵەتی پێدراوە و هەڵبژێردراوە، وە بەڕێوەبەری كارەكانی جیهانە-پاشان دەپاڕێتەوە لێی و دەڵێت-: ويا غوثي أنت المحي وأنت المميت، وأن النبي هو القاسم  وأنت الموصل شيئاً لله الشيخ عبدالقادر! غوث

وه موشریكێكی تر دەڵێت:

ناد على الأربعة يلي أنت لهم محتاج          أربع سلاطين أماري لابسين التاج

أحمد و يا أحمد[٥٨]نظرة يا أبا فراج          دسوقي وجيلاني نظرة يا ساكن بغداد

---

[٥٦] أحمد البدوي:ئیمامێكی ڕێچكەی سۆفیگەریە لەشاری فاسی مەغریبی لە دایك بووە، وە شوێنی بڵاوبونەوەی ڕێچكەكەی شاری(طنطا)یە كاتێك هیجرەتی كرد بۆ ئەم شارە، وە سێیەم قطبی دەسەڵاتە لەلای سۆفییەكان، وە ڕێچكەی(بدوی)دەدرێتە پاڵ ئەم كابرایە، كە خاوەن ئاڵایەكی سوورن، وە پێی وتراوە(بدوي)چونكە بەردەوام دەم  چاوی داپۆشیوە وەك خەڵكی لادێكان، وە نازناوی زۆری هەیە وەك:(شيخ العرب)(السطوحي)، وە چەندان كەڕاماتی دراوەتە پاڵ زیاتر ئەوەی لەناو خەڵك بڵاوە ڕزگاركردنی ئەسیرە میصرییەكانە لەدەستی خاچپەرستەكان لە ئەوروپا كە دەستبەسەركرابوون لەلایەن خاچپەرستەكان، بۆیە تاوەكو ئێستاش لەناو كلتوری میصرِ وتەیەكیان هەیە دەڵێن:(هي الله يا بدوي جاب اليسرى) ، وە ساڵانە لە شاری(طنطا)دوو ئاهەنگی بۆ سازدەكرێ .

[٥٧] راجع كتاب حدائق بخشش ، للبريلوي:٢٦-١٢٥-١٢٦)

وە هاتووە لە شەیخی پایە بەرز(الشعراني)لە (طبقات)ەکەی دەربارەی(أحمد البدوی) کە دەڵێت:( (سيدي عبدالعزيز)کاتێك پرسیاری لێدەکرا دەربارەی(سيدي أحمد) دەیووت:(دەریایەکە و لەنگەرگرتنی بۆ نییە، هەواڵ و نهێنیەکانی تاوەکو فەرەنسا ڕۆیشتووە، خەڵك لە شەقامەکان هانا و هاواری بۆ دەبەن، ڕێز و گەورەیی نوسینەکان هەڵی ناگرن!)

شێخ شعرانی دەفەرمووێ: منیش دەڵێم :(لە ساڵی ٩٤٥بەچاوی خۆم بینیم ئەم کابرایە لەسەر منارەی(عبدالعال) بەسترابووەوە و عەقڵی لە دەست دابوو، پرسیارم لێکرد، ووتی:کاتێك لە فەرەنسا بووم لە درەنگانی شەو ڕوومکردە(سيدي أحمد) لە کاتێك منی گرت و لە ناو گۆشەیەك داینام و بەرزی کردمەوە و لە ئاسمانەوە فرێیدام) شێخ شعرانی دەڵێت: دووڕۆژ لای مامەوە سەری دەسوڕا بەهۆی ئەو فڕێدانە[٥٩].

لە پاش ئەمانە، کەس وانەزانێ ئەمانە شیرك نین، بەڵکو لە شیرکی جاهیلییەتی سەرەتا خراپترە، چونکە هاوبەشدانەرانی جاهیلیەتی سەرەتا لەکاتی ناخۆشی هاواری غەیری خوایان نەدەکرد، بەڵام ئەمڕۆ وەکو لەم چەند پەڕەیەی پێشتر باسمان کرد و خۆشمان ئاگادارین کە ئوممەتی ئیسلامی تووشی کارەساتێکی ترسناك بوە لە گشت شوێنێك هاواری غەیری خوا دەکرێت لە شتانێك کە نەسوود و زیانیان هەیە، نە دەبینرێن و نەدەبیسترێن، بەڵکو هیچ یەکێکیان بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەگەر تەنها داو لە الله بکات ڕزگاری دەبێت!!.

بۆ خوا پێم بڵێ: کامە کۆمەڵە ڕێگای ڕاستیان گرتووە؟وە کام بانگەواز بەهێزتر و پتەوترە؟سەیرکە ڕەحمەتی خوات لێبێ ئەو بیروباوەڕە شەیتانیانە چیان بەو خەڵکە کردووە؟وەبەرەوە کێی بردوون؟وە ئوممەی ئیسلامی هەنگاوی بەرەو چیناوە؟ وە چۆن شەیتان بەسەریان زاڵبووە کا ئا ئەو هەموو جۆرە بتە دەپەرستن؟ إنا لله وإنا اليه راجعون.

بەڵام لەمە خراپتر و ترسناکتر ئا ئەو بەناو زانا و شێخانەنە کە شیکردنەوە و عوزر بۆ ئەو موشریکانە دەهێننەوە، دەڵێن:ئەم کارە دروستە و خودا داوای لێکردووین هۆکارێك بگرینە

---

[٥٨] (أحمدی یەکەم مەبەست پێی أحمد رفاعیە، وە أحمدی دووەم مەبەست پێی أحمد بدوی)

[٥٩] (طبقات الكبرى للشعراني:١٦٢/١)

بەر بۆ نزیکبوونەوە لە خۆی، وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾واتە:(هۆکارێك بگرنە بەر بۆ نزیکبوونەوە لە خوا) وە ئەمەش بنەڕەتی تەوەسولە کە خوا داوای لێکردووین و دروستە و بەباشە باس کراوە لە ئیسلام!!!

وە دەڵێن:ئەو ئایەتانە کە قورئان باسی کردووە دەربارەی شیرکی هاوبەشدانەران تایبەت بووە بە خۆیان و بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئێستا دەکرێ، چونکە هاوبەشدانەران لەسەردەمی پێغەمبەر بیروباوەڕیان بە بتەکان بووە پێیان وابووە کە هێز و دەسەڵات لەسەر بەخشینی چاکە و ڕێگری خراپە تەنها لەو بتانەیە نەوەك لەخوا!!

دەڵێین: سبحان الله، گومانی یەکەم:(وسیلة) لە ئایەتەکە گشت ڕاڤەکارانی قورئان دەفەرموون مەبەست پێی عیبادەت و چاکەکانە، کە ئەمەش لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە جێگیر بووە کە بەهۆی عیبادەتەکان لە خوا نزیك بینەوە، وە گومانی دووەم: ئەگەر جاهیلەکان هەموو بیروباوەڕێکیان تەنها بە بتەکان بوایە ئەوا نەیاندەکرن بە تکا و ناوبەندێك لە نێوان خۆیان و خوای پەروەردگار، وە ئەمە مانای ئەم ئایەتەیە: ﴿ وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ ﴾ ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ﴾.هاوبەشدانەران تەنیا لە بواری بیروباوەڕ لە ئیسلام لایاننەدابوو، بەڵکو جگە لە بیروباوەڕ لە بوارەکانی خۆشویستن و گەورە دانان و بەرز ڕاگرتن و چەندین بابەتی تر لایاندابوو.

وە مامەی پێغەمبەر(ﷺ)کە بە بیروباوەڕەوە دەیزانی دینی ئامۆزاکەی حەق و ڕاستە کە ئەمەش جێگیر بووە لە چەندان شیعری وەك دەڵێت:

و لقد علمت بـأن ديـن محمـد مـن خـيـر أديـان البريّـة دينـا

لـولا الملامــة أو حـذِارٌ مسُـــبَّة لوجـدتـني ســمحا بــذاك مبينـا

واتە:(بە دڵنیاییەوە دەزانم کە دینی محمد لە باشترین دینەکانە، ئەگەر ترسی لۆمەکردن و قسە پێوتنی گەلم نەبوایە ئەوە گوێڕایەڵ و شوێنکەوتووی دەبم).

دیاره ئەم فکرە بۆگەنە کە بریتییە لە کۆکردنەوەی کوفر تەنها لە بیروباوەڕ  لە مێژووی ئیسلام بوونی هەبووە و چەندان فیرقە دەرکەوتووە.

بۆیە(ابن القیم)دەفەرمووێ:(خوای گەورە هەموو ڕێگاکانی پچڕاندووە کە هاوبەشدانەران دەیگرنە بەر﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ﴾، موشریك بۆیە شتێك دەکاتە پەرستراو چونکە بەهۆیەوە سودێکی بە دەست بکەوێ، وە سوودگەیاندنیش نایێتە بوون تا چوار سیفاتی تێدا نەبێت، یان ئەوەتا دەسەلاّتی بەسەر ئەوشتە هەیە کەداوای لێدەکرێ،  وە یان ئەگەر دەسەلاّتی نەبێت ئەوە شەریك و هاوبەشیەتی، وە یان ئەگەر شەریك و هاوبەش نەبێت ئەوە سەرخەر و پشتیوانیەتی، وەیان ئەگەر سەرخەریش نەبێت ئەوە تکاکاریەتی، بۆیە خوای گەورە ئینکاری و نەفی هەر چوار سیفاتەکەی کرد، ئینکاری دەسەلاّت و هاوبەشی و پشتیوانیەتی و تکاکردن کە هاوبەشدانەران بەهۆیەوە داوا لە پەرستراوەکانیان دەکەن، بۆیە ئەگەر تەنها ئەم ئایەتە بۆمان هاتبا ئەوە بەسمان بوو بۆ ڕێنموویی و هیدایەت  بۆ یەکتاپەرستی، وە بەسییەتی بۆ ڕێگری و نەهێشتنی بنچینەی شیرك، بۆیە قورئانیش پڕیەتی لەم نموونانە).

بۆیە لە(قصیدة)کەی بەهەمان مانا دەفەرمووێ:

والشرك فهو توسل مقصوده الزلفى     من الرب العظيم الشأن

بعبادة المخلوق من حجر ومن     بشر ومن قبر ومن أوثان

والناس في هذا ثلاث طوائف     ما رابع أبدا بذي إمكان

أحد الطوائف مشرك بإلهه     فإذا دعاه دعا إلها ثان

هذا وثاني هذه الأقسام     ذلك جاحد يدعو سوى الرحمان

هو جاحد للرب يدعو غيره     شركًا وتعطيٍ لا له قدمان

هذا و ثالث هذه الأقسام خير     الخلق ذاك خلاصة الإنسان

يدعو إله الحق لا يدعو ولا          أحداً سواه قط في الأكوان

يدعوه في الرغبات و الرهبات          والحالات من سر ومن إعلان

وه خواى گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰؤُلَاءِ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴾

كە داواى ئەوەمان لێدەكات گومانمان نەبێت كە كافر و بێبڕوايان لەناو گومڕايدان.

﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا ﴾﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾.

لێرە بابەتێك هەیە پێویستە لەسەرى بوەستین و باسى لێوە بكەین كە ئەویش كافركردنى كەسێكە كە هەڵوەشێنەرێكى ئاشكراى ئیسلامى ئەنجاماوە، ئەو بابەتەى كە لە ڕاستیدا لە ترسناكترین بابەتەكانە چونكە شارەزانەبوون لە بابەتى یەكتاپەرستى و بەشەكان و شیرك وجۆرەكانى و هۆكارەكانى دەرچوون لە ئیسلام دەبێتە هۆى لادان لە ڕاستى و كەوتنە ناو دوو ڕێگا یان ئەوەتا بەرەو زیادەڕۆیى دەچێت وەكو خەواریجەكان یان ئەوەتا بەرەو كورتڕەوى دەچێت وەكو(غلاة المرجئة) كە دووركرتنێكى فاسیدیان گرتۆتە بەر! ! ئەمەش بووەتە هۆى تێكەڵبوونى حەق و ڕاستى لە خەڵك و كەمتەرخەمى لە تێگەیشتنى یەكتاپەرستى و شارەزانەبوون لە شیرك و بابەتەكانى.

ڕاستى ئەم بابەتەش بەهۆى دوو گومانەوەیە:

یەكەم: شیرك لەناو ئومەتى ئیسلامى ڕوونادات ئەگەر كاروكردەوەى هاوبەشدانەرانى سەرەتاش بكەن.

دووەم: ناشێت ئەو ئایەتانەى دەربارەى هاوبەشدانەرانى سەرەتا هاتۆتە خوارەوە جێبەجێبكرێت لەسەر ئەو كەسانەى كە ئێستا هەمان كاروكردەوە دەكەن.

شوبهەی یەکەم: (محمد بن عبدالوهاب)ڕەددی دەداتەوە لە کتێبی(التوحید) لە ژێر بابەتی:(ئەو ئایەت و فەرموودانەی دەربارەی ئەوە هاتووە کە هەندێك لەو ئوممەتە بت دەپەرستن)

ڕاڤەکارانی کتێبی (توحید) دەفەرموون:(مەبەستی نوسەر لەم بابەتە ڕەددانەوەی قەبرپەرستەکانە، کە شەریك بۆ خوا بڕیاڕ دەدەن و دەڵێن:(لاإله إلا الله محمد رسول الله)، لەم بابەش بە وتەی خوا و پێغەمەبەرکەی ئەم بابەتە ڕوون دەکاتەوە، کە شیرك لەناو ئەو ئوممەتە چەندین جۆرە کە هەموویان بۆ بت پەرستی دەگەڕێتەوە، ئەگەرچی کۆمەڵێك خەڵك بەردەوام لەسەر حەق و ڕاستی دەمێننەوە تاوەکو ڕۆژی دوایی.

وە پاش شەرحکردنی ئایەتەکان فەرموودەیەکی هێناوەتە لە (أبا سعيد الخدري) کە پێفەمەبەر(ﷺ)فەرموویەتی:( لتَتبعن سنن من كان قبْلكم حذو القذة بالقذة حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه، قالو: يا رسول الله!اليهود والنصارى ؟ قال": فمن) وە پێغەمبەر(ﷺ)پێی ڕاگەیاندووین کە ئەم ئوممەتە کردەوەی میللەتانی پێش خۆی ئەنجام دەدات لە پەرستشەکان و نەریت و سیاسەت ، وە ئەم فەرموودەیە لەگەڵ بابەتەکە دەگونجێ، چونکە میللەتانی پێش ئێمە شیرك لەناویان بوونی هەبووە، بەهەمان شێوە ئێستاش لەناو ئەم ئوممەتە بوونی هەیە.

وە پاشان ئەم فەرمودەیەی هێناوەتەوە:(ولا تقوم الساعة حتى يلحق من أمتي بالمشريكين، وحتى تعبد فئام من أمتي الأوثان)کە ماناکەی ڕوون و ئاشکرایە، وە ئەمەش مەبەستمانە لەم بابە کە ڕەددی ئەو گۆڕپەرستانە دەداتەوە کە بە پێچەوانەوە ئینکاری بوونی شیرك و بت پەرستی لەناو ئوممەت دەکەن، وە فەرموودەیەکی تر بەهەمان شێوە:( لا تقوم الساعة حتى تضطرب أليات لنساء دوس على ذي الخلصة) ، (ذي الخلصة)بتێکی دەوسیەکان بووە کە لە جاهیلیەت پەرستوویانە، وە(ابن حبان)گێراویەتیەوە لە(معمر)کە دەفەرمووێ:(ئێستا ئەم بتە لەناو خانوویەکی دیارە و داخراوە)، وە لە سەحیحی مسلیم هاتووە لە دایە عائشە کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی:(لا يذهب الليل والنهار حتي تعبد اللات والعزى) واتە:(شەو و ڕۆژ کۆتایی نایێت تاوەکو جارێکی تر لات و عوزا نەپەرسترێتەوە) وە وتراوە:ئەو گۆڕەی دراوەتە پاڵ(ابن عباس)لە تائیف ئەوە گۆڕی لاتە، کە دەیانپەرست و بەدەورەی دەسوڕانەوە خۆیان

نزيك دەكردەوە بەئەنجامدانی چەندین جۆر لە عیبادەت، وە داوای جێبەجێکردنی کار و پێویستیەکانیان لێدەکرد).

وە شێخ(عبدالرحمن سعدی)دوای هێنانەوەی هەمان باب لە(کتاب التوحید) دەفەرمووێ: مەبەست بە سەرەبابەتەکە ئاگادار کردنەوە و ترساندنە لە شیرك ، وەشیرك شتێکە لەناو ئوممەت بوونی هەیە و ئینکاری ناکرێت، وە هەروەها ئەم بابە ڕەددانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە واگومان دەبەن کە کەسێك بڵێت:(لا اله الا الله) و بڵی من موسڵمانم ئەوە لەسەر ئیسلام دەمێنێتەوە ئەگەر هەرشتێکیش ئەنجام بدات کە پێچەوانەی ئیسلام بێت لە هاوارکردن و پاڕانەوە لە گۆڕ و پیاوچاکان.

چونکە بت: ناوێکی گشتییە بۆ هەموو شتێك کە لە غەیری خوا دەپەرسترێ، وە جیاوازی نییە ئەو بتە دارێك بێت یان بەردێك یان گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان لەم بوارە، کە عیابەدەتکردنی غەیری خوایە، هەرکەسێك هاوار لە غەیری خوا بکات و بیپەرستێت ئەوە کردوویەتی بە بت و بەم کارەی لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە، وە خۆدانەپاڵی بۆ ئیسلام سودی پێناگەیەنێ، چەندان کەس کە خۆیان دەدەن پاڵ ئیسلام لە کاتێك کافر و دووڕون و بێدینن، بۆیە عیبرەت بە ڕوح و بنچینەی دینەکەیە، نەوەك تەنها ناو و شێوازێك بێت کە بنچینەی نەبێت)[٦٠].

وە شوبهەی دووەم:کە نابێت ئەو ئایەتانەی لەسەر هاوبەشدانەرانی پێشوو هاتۆتە خوارەوە جێبەجێبکرێ لەسەر کاروکردەوەی خەڵکانی ئێستا.

ئەم گومانەش چەندین زانا ڕەددیان لێ داوەتەوە، وەك(أبا بطين)کە دەفەرمووێ:(وتەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئەو ئایەتانەی لەسەر هاوبەشدانەران هاتۆتە خوارەوە، ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە هەمان کردەوە ئەمان دەکەن ، ئەم وشەیە کوفرێکی گەورەیە، وە هیچ کەسێك ئەم قسەیە ناکات تەنها کەسێك کە لەناو گومڕایی و نەزانی نغرۆ بووبێت ، ئایا دەوترێ ئەو سزا و حەددانەی کە دانراوە تەنها بۆ خەڵکانی پێشوو بووە و تێپەڕیوە؟ئەمڕۆ حەددی زینا

---

[٦٠] (القول السدید في مقاصد التوحید:٧١-٧٢)

جێبەجێناکەرێت! دەستی دز نابڕین! وە نموونەکانی تر، بەڕاستی ئەمە قسەیەکە موسڵمان شەرم دەکات باسی لێوە بکات، ئایا دەوترێ فەرمانکردن بە نوێژ و زەکات و هەموو دروشمەکانی تری شەرع تێپەڕیوە و بۆ ئێستا نابێت! ئەم بۆچوونە قورئان بە باتڵ دەخاتەوە)[٦١].

وە شێخ(عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ)لە ڕەددی ئەم گومانە دەفەرمووێ: (هەرکەسێك ڕێگری بکات لە دابەزینی ئایەتەکان بۆ سەر خەڵك و جێبەجێکردنی حوکم و سنورەکان، ئەوە گومڕاترین کەسە، وەنەزانترین کەسە بەو بەرنامەی کە ئەهلی ئیسلام و زانایان لەسەری بوونە چاخ لەدوای چاخ، نەوە لەدوای نەوە، وە گەورەترین تاوانی کردووە کە لە کارخستن و دوورەپەرێزییە لە قورئان کە لەکاتی کێشە پێویستە بگەڕێینەوە بۆی، دەقە قورئانییەکان گشتین و تایبەتی نین بۆ هیچ کەس و سەردەمێك تەنها بە بەڵگە نەبێت، باشە چ شتێك ڕێگرە لە کافرکردنی ئەو کەسەی کە هەمان کردەوەی گاور و جولەکە ئەنجام دەدات لە بوون بە بەربەست لەبەردەم دینی خوا و کوفرکردن لەگەڵ زانینی؟!)[٦٢]

وە شێخ(عبداللطيف)ڕوونی کردۆتەوە کە ئەم گومانە لەو هۆکارانەیە کە ڕێگرە لەبەردەم تێگەیشتن لە قورئان :(لەو هۆکارانەی کە ڕێگرە لە تێگەیشتنی قورئان واگومان دەبەن کە خوای گەورە باسی هاوبەشدانەران دەکات، وە ئەو وەسف و باسکردنانەی هاوبەشدانەران تایبەتە بە گەلێك کە ڕۆیشتوون، وە دەشێ کەسێکی گومڕا کاتێك گوێی لە ڕاڤەکارێکی قورئان دەبێت کە دەفەرمووێت: ئەم ئایەتە دەربارەی بت پەرستان دابەزیوە، وە ئەم ئایەتە دەربارەی گاور دابەزیوە... وا گومان ببات کە ئەم ئایەتانە تایبەتین بەو کەسانەی کە باسکراوە!!حوکمەکە خەڵکانی تر ناگرێتەوە، کە ئەمە گەورەترین هۆکارە کە ڕێگرە لەنێوان بەندە و تێگەیشتن لە قورئان و سوننە)[٦٣].

---

[٦١] (الدرر السنية:٨/٢٣٧).

[٦٢] (مصباح الظلام:١٤٠)

[٦٣] (دلائل الرسوخ:٤٤).

وه(ابن سمحان)دهفهرمووێ:( هەرکەسێك کردەوەی هاوبەشدانەران بکات لە شەریك دانان بۆ خوا، بەوەی مافی خوا بۆ کەسێکی تر ئەنجامبدات ئینجا پێغەمبەران بن یان پیاوچاکان، بپارێتەوە و هاواریان بۆ بەرێت و داوای شتێکیان لێبکات کە دەبێ تەنها داو لە خوا بکرێت، باشە چ شتێك ڕێگرە لە دابەزاندنی ئەم ئایەتانەی کە باس لە کردەوەی بێبڕواکان دەکات و بەکافریان دادەنێت، وە زانایان باسیان کردووە(العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب) واتە:عیبرەت بە گشتی ووشەیە نەك بەتایبەتکردنی هۆکار )[64]

وە (محمد رضا)نەفامی و نەزانی ئەو کەسانە ڕووندەکاتەوە کە ئەم گومانەیان هەیە و دەفەرمووێ:(لە نەزانی(دحلان) و هاوشێوەکانی کە وا گومان دەبەن قورئان کە باسی هاوبەشدانەرانی ڕوون کردۆتەوە تایبەتە بە خودی ئەو هاوبەشدانەرانە و بەڵگە نییە لەسەر کەسێك کە هەمان کردەوە ئەنجامدەدات، وەك بڵێت هەرکەس بە موسڵمانی لە دایك بێت ئەو شیرك بۆی دروستە بەهۆکاری ناسنامەی ئیسلامەتیەکەی! !ئەگەر بچێت هەموو جۆرەکانی شیرك ئەنجامبدات هەوو ئەو شیرکانەش بکات کە هاوبەشدانەران کردوویانە! !کەواتە بەم بۆچوونە هەرگیز هەڵگەڕانەوە(ردە)ڕوونادات، چونکە ئەو کەسەی پێی بوترێ موسڵمان ئەو کوفر و شیرکەکەشی ئیسلامەتییە! !یان ڕێگادراوە بۆی یان کەمترین شت حەڕام! !)[65].

[64] (كشف غياهب الظلام عن أوهاب جلاء الأوهام:١٩٥)

[65] (الهدية السنية:١١٦)

پێش ئەوەی لەم بابەتە دەرچم: هیچ کەسێك وا گومان نەبات کە ئێمە عاممەی موسڵمانان کافر دەکەین کە ئیسلامەتیەکەیان جێگیر بووە، چونکە من بەریم لە بیروباوەڕی خەواریجەکان و مورجیئەکان بە یەك شێوە، وە سوپاس بۆ خوا ئێمە شوێنکەوتەین نەوەك بیدعەکار ، وە بیروباوەڕ و ڕێگامان کە خواپەرستی پێوە ئەکەم مەزهەبی(أهل السنة والجماعة)یە کە پێشەوایانی موسڵمانان لەسەرین، وە سکاڵای خۆم دەبەم بۆ لای خوا لەو کەسەی کە باسی من یان کتێبەکەم بکات بە کافرکردنی موسڵمانان یان هێندێك وەصفی بکات بۆ ئەوەی موسڵمان لە یەکتاپەرستی خوا دوورخاتەوە[٦٦].

ونبرأ من دين الخوارج إذا غلوا   بتكفيرهم بالذنب كل موحد

وظنوه دينًا من سفاهة رأيهم      وتشديدهم في الدين أي تشدد

ومن كل دين خالف الحق والهدى      وليس على نهج النبي محمد[٦٧]

---

[٦٦] (لەو تۆمەتانەی کە دژەکانمان دەماندەنە پاڵ:کە ئێمە خەواریجین، ئەمەش بەهۆی جەهل و تێنەگەیشتنیانە لە جیاوازی نێوان بیروباوەڕی خەواریج و ئەهلی سوننە، کە ئەهلی سوننە هاوبەشدانەران بە کافر دادەنێن، وە موسڵمانی تاوانبار بەهیچ شێوەیەك کافر ناکەن ، بەڵام خەواریج تاوانباری موسڵمانیان کافر دەکرد، کە ئەمە بوو بە شوێنی جیاوزیی نێوان ئەهلی سوننە و خەواریجەکان، جیاوازییەکەیان لە شیرك و کوفر نەبوو، بۆیە ئێمەش سوپاس بۆ خوا هەرگیز موسڵمانێکی تاوانبارمان کافر نەکردووە جگە لە کەسێك کە شیرك و کوفری گەورە ئەنجام بدات، چونکە بنچینەی ئەهلی سوننە بریتییە لە: تەوحید کە دژەکەی شیرکە، عیبادەت کە دژەکەی تاوانە، سوننەت کە دژەکەی بیدعەیە.

بۆیە بابەتەکە بابەتی کوفر و ئیمانە، بابەتی ئیمانە کە چۆن موسڵمان دێت بۆ ناو دینی ئیسلام، وە بابەتی شیرکە کە زۆر کەس لێی تێکەڵ بوو، بۆیە برای هاودینم هەوڵی شارەزابوون وتێگەیشتن بدە لە بابەتەکان.

بیروباوەڕی ئێمە لەسەر دینی پێغەمبەران و یەکتاپەرستان بنیاتنراوە لە سەرەتاوە تا کۆتایی، کە دژایەتی شیرك و هاوبەشدانەرانە، وە بەکافر دانانیانە، وە ڕق لێبونەوە و دژایەتی کردنیانە، وە بەکافرکردنی ئەو کەسەشە کە بە کافریان لە قەڵەم نادات، چونکە ئەم بابەتە جیاکاری ئیسلام و جاهیلییەت، جیاکاری کوفر و ئیمانە پێویستە ڕوون بکرێتەوە و تێکەڵ نەکرێت).

[٦٧] (صيانة الإنسان للسهراني:تعليق محمد رشيد رضا:٤٨٧)

دووەم:بیروباوەڕی جاهیلیەتی ئێستا دەربارەی یاسا و تەشریع دانان.

پێشەکی:

پێویستە خوێنەر لەم بەشەدا مانای ووشەکانی(إله–رب–العبادة)بە مانایەکی فراوان بزانێت، چونکە کۆکردنەوەی ئەم وشانە تەنها لە چەند مانا و مەبەستێکی بەرتەسك وای لە خەڵك کردووە کە بێ ئاگابن لە بانگەواز و مەبەستی ڕاستەقینەی قورئان.

کاتێك قورئان دەڵێت: لە غەیری خوا هیچ(اله)ێك مەپەرستن، خەڵك پێیان وایە داواکارییەکەی خوایان جێبەجێ کردووە چونکە وادەزانن تەنها بە مانای ئەوە دێت هیچ بتێك نەپەرستن، بۆیە هەموو ماناکانی(اله)یان دەرهێناوە تەنها مانای بت پەرستیان هێشتۆتەوە، کە ئەمەش هەڵەیە.

وە کاتێك قورئان بانگیان دەکات کە خوای پەروەدگار(رب)ە، لە غەیری خوا هیچ(رب)کمان نییە، دەڵێن:ئێمە دەزانین تەنها خودا پەروەردگار و بەڕێوەبەری کارەکانمانە پێمان وانییە کەسێکی تر هەبێت کە دروستکار بێت، بۆیە ئیمانمان تەواوە!! بەڵام لە کاتێکدا لە چەندین بابەتی(ربوبية) لادانیان هەیە.

کاتێك قورئان گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات کە خواپەرستن و واز لە تاغووتەکان بێنن، دەڵێن:ئێمە بتەکان ناپەرستین و ڕقمان لەشەیتان و نەفرەتی لێ دەکەین!!

ئەمانە چەند نموونەیەك بوون لە دەستەواژە شەرعییەکان کە بە هەڵە بۆ خەڵك گواستراوەتەوە، بۆیە(محمد قطب)کتێبێکی هەیە بەناوی(أخطاء يجب أن يصحح)باس لەو فیکر و بۆچوونانە دەکات کە بەهەڵە بڵاوبۆتەوە و پێویستە ڕاست بکرێنەوە، وە باشترین کتێب لە بواری ناسینی ئەم دەستەواژانە کتێبی(مصطلحات الأربعة)هی(أبو الأعلى المودودي) کە باس لە دەستەواژەکانی(الدين–العبادة–إله–الرب)دەکات بەشێوەیەکی فراوان و زۆر

بەسوودە، بۆیە خەڵك لەم سەردەمەی ئێمە ڕاستە بت و دارو بەردی داتاشراو ناپەرستێ بەڵام لەبەرامبەردا بێئاگایە لەوەی کە عیبادەت بۆ چەندین تاغووتی دانەتاشراو دەکات ، وەکو: پەرستنی دەسەڵاتدار و سەرکردەکان– وە یاسا و دەستورەکان– وە پەرلەمان و دانیشتنە شیرکیەکان.

مانای ئەم ووشانە:

ووشەی(اله)بە واتای پەرستراو(معبود)دێت، کە بەماناکانی:بەرزیەتی–دەسەڵاتداری–گەڕانەوە بۆی لە کاتی ناخۆشی دێت، خوا دەفەرمووێ:(قال لئن اتَّخذت الهاً غيري لأجْعلنَّك مِن المسْجونِين)لێر بەمانای بەرزیەتی و بوونی دەسەڵات دێت.

وە ووشەی(رب) بە ماناکانی:بەرزیەتی–دەسەڵات–موڵکداری–گەورەیی واتە شایستەی گوێڕایەڵ بوون–سەرکردە–خاوەن دەسەڵات کە حوکمەکانی جێبەجێ دەکرێت–وە ستایشکراو بە بەرزی و گەورەیی–دێت.

خوای گەورە لەسەر زوبانی فیرعەونی تاغووت دەفەرمووێ: ﴿ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ * فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾ کە ووشەی(رب)لەم ئایەتە بەواتای خاوەن دەسەڵاتێکە کە حوکمەکانی جێبەجێ دەکرێت وە ستایشکراوە بە بەرزیەتی و گەورەیی.

وە (العبادة)لە زوبانەوانی بە واتای:زەلیلی و ملکەچی واتە:تەسلیمبوونی مرۆڤ بۆ کەسێك کە دەسەڵاتێکی ئێجگار گەورەی هەبێت و نەتوانێ بەرامبەری بوەستێ و لە فەرمانی دەرچێت و تاوان بکات.

وە لە ڕووی شەرعەوە: بەناوبانگترین پێناسە پێناسەکەی(ابن تيمية)یە کە دەفەرمووێ:(اسم جامع لكل ماى يحبه الله ويرضاه من اللأقوال والأفعال الظاهرة والباطنة، والبراءة مما ينافي ذلك ويضاده)واتە:(ناوێکی کۆکەرەوەیە هەموو وتە و کردەوەی ئاشکرا و پەنهان دەگرێتەوە، وە بەری بوون لەو شتانەی کە پێچەوانە و دژی ئەمەیە).

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ وە لە ئایەتێکی تر ﴿ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴾ئیمامی (طبري) لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووێ:(لنا عابدون: مەبەست پێی:ئایا گەلەکەمان بۆ ئەم دوو کەسە گوێڕایەڵ و ملکەچ بن، فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن و دینداری لەسەر ڕێگای ئەوانە بکەن).

وە لە فەرمودە هاتووە لە(عدی کوڕی حاتم)کە دەفەرمووێ:(چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)خاچێك بەملمەوە بوو کە لە زێڕ دروستکرابوو، پێغەمبەر(ﷺ)ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:(اتَخذوا أحْبارهم ورُهبانَهم أرباباً مِن دون الله والمَسيح ابْن مريم وما أمِروا ألا لِيعبُدوا الله الهاً واحداً لا إله إلا هو) دەفەرمووێ: ووتم:ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوان گەروەکانیان نەدەپەرست !پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئایا ئەوان کاتێك شتێکیان حەلاڵ دەکرد ئێوەش حەڵاڵتان نەدەکرد، وە کاتێك شتێکیان حەڕام دەکرد ئێوەش حەڕامتان نەدەکرد، وتم: بەڵێ، فەرمووی:دەسا ئا ئەوە عیبادەت و پەرستنە).

مامۆستا(سید قطب)پاش ئەوەی تەفسیر (ابن کثیر) دەهێنێتەوە لە(عدی ابن حاتم)، وە وتەکەی (سدي):( استنصحوا الرجال ونبذوا كتاب الله وراء ظهورهم) ، وە(آلوسي)کە لە تەفسیرەکەی دەفەرمووێ:(زۆربەی ڕاڤەکاران دەفەرموون:مەبەست بە(أرباب)لە ئایەتەکە ئەوەنییە کە بیروباوەڕیان وابووە کە گەورە و خواپەرستەکان خوای هەموو جیهانن، بەڵکو مەبەست پێی گوێڕایەڵیان کرد لە فەرمان و نەهییەکان)

سید دەفەرمووێ:(لەو دەقە قورئانییە ڕوون و ئاشکرایە، وە لەو شیکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ)بۆ دەقی ئایەتەکە، وە لە تەفسیری زانایانی پێشین وئێستا، بۆمان ڕوون دەبێتەوە بە دەقی قورئان و شیرکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) کە عیبادەت بە واتای شوێنکەوتنی شەریعەت دێت چونکە جولەکە و گاورەکان گەورەو عابیدەکانیان نەکرد بە خوا بەو مانایەی پێیان وابێت ئەوان دروستکارن و مافی پەرستنیان هەیە یان دروشمە دیارەکانی پەرستن ئەنجام بدەن بۆیان بەڵام خوا حوکمی شیرك و کوفری بڕیاردا لەسەریان تەنها بەوەی یاسا و دەستوریان لە غەیری خوا وەرگرت و گوێڕایەڵ و شوێنکەوتووی بوون بەبێ ئەوەی

بیروباوەڕ و دروشمێك بۆ غەیری خوا ئەنجامبدەن كە لە ڕێزی ئیمانداران بیانباتە دەرەوە بۆ ڕێزی بێبڕوایان).

لە پاشان...ئا لێرە ئێمە گەیشتین بەو كێشە ڕاستەقینەی، كە لە ئێستا و داهاتوو شوێنی ڕاستەقینەی ململانێیە لە نێوان ئیسلام و جاهیلییەت لە هەموو بوارەكانی ژیان... ململانێی بیروباوەڕە لەسەر دەسەلآت و حاكمییەت...لەسەر پەرستنی خەڵك.. بۆیە ناوەڕۆكەكەشی بەدوای وەڵامی پرسیارێك دەگەڕێت....كە ئایا كێ مافی یاسا و تەشریع دانانی هەیە بۆ سەر زەوی و ژیانی خەڵك؟ ئایا تەنها مافی خوایە....یان مافی چەندین خوای ترە؟!

*كێ مافی سیاسەت و یاسا و تەشریع دانانی هەیە لە جاهیلیەتی ئێستا؟

پێناسەی(السیادة):

السادة : ئەو دەسەلآتە بەرز و چەسپاوەیە كە یەك كەس مافییەتی لە ئاڕاستەكردنی وتەكان بۆ كۆمەڵگا كە پەیوەندی هەیە بە كردەوەكانی مرۆڤ، ئەم فەرمانەش بە شێوازی داواكردن یان دانان دەچەسپێ.

یاسا و فەرمانەكان كە دەردەكرێ بە دووشێوەیە:

شێوازی داواكردن:داواكردن بە كردن یان نەكردنی كارێك، یان سەرپشك كردنە لە نێوان كردن و نەكردن، بۆیە شێوازی داواكردن پەیوەندی بە شتێك هەیە كە واجبە یان حەڕامە یان مباحە.

شێوازی دانان:پەیوەندییەكە لە نێوان دوو شت بەهۆی هۆكارێك یان مەرجێك یان ڕێگرییەك، كەوابوو شێوازی دانان پەیوەندی بە شتێكە كە هۆكارە یان مەرجە یان ڕێگرییە.

كەوابوو(سیادة)بە وتای ئەو دەسەلآتە تەنهایە دێت كە دەتوانێ ووتار و قسە ئاڕاستە بكات لەسەر كارەكان، وە دەسەلآتی هەیە شتەكان حەڕام بكات یان حەلآڵ یان مباح، وە دەسەلآتی هەیە شتەكان بكات بە هۆكار یان مەرج یان ڕێگری.

ئینجا سەرنج بدە(سیادة)و(دیموكڕاسی)دوو دەستەواژەن لە یەك فیكرەدا، (سیادە)دەستەواژەیەكی یاساییە،(دیموكڕاسی)دەستەواژەیەكی سیاسییە.

(سیادة) له جاهیلییەتی ئێستا به سێ شێوازی سەرەکی بەرجەستە بووە:

یەکەم:السلطة التشریعیة:کاری تەنها دانانی یاسا و تەشریعە کە پەیوەندی بە گشت بوارەکانی ژیانی مرۆڤ هەبێت.

دووەم:السلطة التفیذیة:کاری پارێزگاریکردنه له دەستووری گشتی، وە شەونوخونی کردن بۆ پاراستنی یاسا و دەستورەکان.

سێیەم:السلطة القضائیة:کاری چارەسەرکردن و یەکلایی کردنەوەی کێشەکانە بە پێی ئەو یاسایەی کە لە(سلطة التشریعي)یەوە دەرچووە.

ئەگەر سەیری ئەو یاسایانە بکەین کە لە ولآتانی عەرەبی و جگە لەمانیش دەرچوووە، دەبینی بۆ چەسپاندنی ئەم سێ دەسەلآتە چەندین دەقی یاسایی لەسەر دانراوە، وەکو چۆن دەبینین لە دەستوورەکان ئێستا بابەتی کورتکردنەوەی شەریعەت و حوکم کردن بە یاسا دانراوەکان لە نیشانە هەرە ئاشکراکانی دەستووری حوکمە، وە جیاکردنەوە دین لە دەوڵەت شتێکی ڕێپێدراوە لە ژێر سایە و سێبەری ئەم دەستوور و یاسایانە، ئەگەرچی دەقیش هەبێت کەدینی ئیسلامی بە دینی فەرمی ولآت بناسێنێ کە تاوەکو ئێستاش لە زۆربەی دەستورەکان ئەمە بوونی هەیە.

باسی هێندێك لەو دەقە دەستوریان دەکەین کە لە ولآتانی عەرەبی هەیە لەسەر چەسپاندنی ئەم بیردۆزە، وە ئاماژەکردن بەوەی کە ئایا کێ مافی یاسا دانان و دەسەلآتی هەیە؟:

– لە مادەی سێیەمی دەستوری(جمهوریة المصر)(١٩٧١)هاتووە:(دەسەلآت و یاسادانان تەنها بۆ گەلە، وە گەل سەرچاوەی دەسەلآتە، وە گەل ئەم سیاسەتە ئاڵوگۆڕ دەکات و دەیپارێزێت، وە یەك پارچەیی ولآت دەپارێزرێ بەشێوەیەکی ڕون و ئاشکرا لە دەستوور).

–وە لە مادەی(٨٦)هاتووە:(ئەنجومەتی نوێنەران مافی یاسا دانانیان هەیە، ئەمەش شتێکی ڕوونە لە دەستوور).

–وە مادەی دوو لە ڕیزی دووەم لە دەستوری(جمهورية سورية)(١٩٧٣)هاتووە:(دەسەڵات بۆ میللەتە، وە گەل هەڵسوکەوت دەکات بە شێوازێکی ئاشکرا لە دەستوور).

–وە مادەی دوو لە دەستوری عێراق(١٩٧٠):(گەل سەرچاوەی دەسەڵات و شەرعییەت دانە).

_وە لەمادەی (٥٣) ی دەستوری هەریمی کوردستان هاتوە و ئەڵێ : ( پەرلەمان بێجگە لەو ئەرکانەی کە بەپیی یاسا پێی یاسا کارپێکراوەکانی هەریم پێی دەسپێردرێن ئەم ئەرکانەشی لەسەرشانە :

سێیەم :

١-دانانی یاسا .

کەواتە حکومەتی کافری کوردستان ڕازی نیە الله تعالى حوکمی بکات و شیاو نیە یاساکانی و مافی ئەوەی نەماوە وەك خۆیان ئەڵێن بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێ کەواتە لای ئەوان پەرلەمان و ئەندام بتخانەکە لە خوا باشتر و پیرۆزتر و خاوەن ماف ترن . !!! پەنا بەخوا لەو بێ ڕێزی و کوفرە.

هەروەها لەدەستوری هەرێمی کوردستان یش هاتوە لە مادەی (٢٢)خاڵی پێنجەم : <u>بەبێ دەقێکی یاسایی، نەتاوان هەیە و نەسزا و ناکرێ هیچ کەس بەکردن ،</u> یان بەنەکردنی کارێك کە لەکاتی ئەنجام دانیدا تاوان نەبووە سزا بدرێ.

باشە بەس پێمان بڵێن ئەمە دین نەبێ چی دینە کە بۆ ئەو خەڵکەیان داناوە خەڵکیش پێوەی پابەند بوە و دەنگی پێداوە ؟!!!ئەزانن ئەوە یانی چی

واتە : نەحەرام هەیە و نەحەلال مادام یاسا شتێکی قەدەغە نەکردبێ ئیتر هیچ دینێ بۆی نیە بڵێ قەدەغەیە ، مادام یاساکەی ئەوان دینەکەی ئەوان شتێکی بەڕەوا نەزانیبێ بۆ هیچ دینێ نیە بڵێ حەلالە ، مادام یاساکەی ئەوان و خواوەندەکانیان ئەو سزایەیان دانەنابێ بۆ هیچ دینێك نیە سزایەتر بڵێ و دابنات. لا حول ولا قوة الا بالله . ئەوەش مشتێکە لە خەرمانێك .

–وە لە فەصلی دوو لە دەستوری(مملكة المغربية)هاتووە:(دەسەلأت بۆ ئوممەتە، گەل ڕاستەوخۆ هەڵسوكەوت لەگەڵ ئەم دەسەلأتە دەكات  بە شێوازی دەنگدان، وە ناڕاستەوخۆش لەسەر دەستی ڕێكخراوە دەستووریەكان).

–ماددەی سێ لە دەستوری ولأتی كوێت هاتووە:(دەستووری حوكم لە كوێت سیاسەتێكی دیموكڕاسیە، میللەت سەرچاوەی هەموو دەسەلأتە، وە ئەم یاسایە جێبەجێدەكرێ بە شێوازێكی ئاشكرا لە دەستور).

– وە مادەی(٢٤)لە دەستوری(مملكة اردنية الهاشمية)هاتووە:(میللەت سەرچاوەی دەسەلأتە، وە هەڵسوكەوتی لەگەڵ دەكا بە شێوازێكی ئاشكرا لە دەستوور).

–وە مادەی(٢٥)لە دەستور هاتووە:(دەسەلأتی یاسادانان دەسپێردرێت بە ئەندام پەرلەمانان، وە ئەندام پەرلەمانانیش لە نوێنەری خەڵك پێكهاتوون).
–لە فەصلی سێ لە دەستوری تونس هاتووە:(خەڵكی تونس خاوەن دەسەلأتن، ڕاستەوخۆ بەشداری دەكەن بەو شێوەیەی كە دەستوور دایناوە).

–وە لە فەصلی(١٨)لەهەمان دەستوور هاتووە:(گەل دسەلأتی یاسا دانان(سلطة التشريعي)جێبەجێ دەكات لە ڕێگەی نوێنەرەكانیان كە پێی دەوترێ شوێنی خەڵك–پەرلەمان–).

–وە مادەی دوو لە دەستووری سودان(١٩٧٣)هاتووە:(دەسەلأت لە سودان دیموكڕاسییە بۆ میللەت، وە گەل جێبەجێی دەكات لە ڕێگای دام و دەزگا ناوخۆیی و دەستورییەكان).

–لەمادەی(٨)هاتووە:(ئەندام پەرلەمانان مافی یاسادانان(سلطة التشريعي) دەسپێرن بە سەرۆك وەزیران).

–وە مادەی(٧)لە دەستوری جمهوری ئیسلامی مۆریتانیا هاتووە:(گەل خاوەن دەسەلأتە...فەرمانی هاتنە خوارەوەی گشت دەسەلأتەكان یان بەشێكی تەنها  پاش ڕازیبوونی گەل دەبێت).

–لەمادەی(٢٦)لەم دەستوورە هاتووە:(دەسەڵاتی یاسادانان تایبەتمەندی ئەندام پەرلەمانانە)

–لە فەقەرەی(د)لەمادەی یەك لە دەستووری وڵاتی بەحرێن(١٩٧٣)هاتووە:(ڕژێمی حوکم لە بەحرێن دەسەڵاتی دیموکڕاسییە، هەموو دەسەڵاتەکان بۆ گەلە، و گەلیش جێبەجێی دەکات بە شێوازێکی ئاشکرا لە دەستوور).

–لەمادەی(٤٢)لەم دەستوورە هاتووە:(هیچ یاسایەك دەرناکرێ تەنها ئەگەر پەرلەمان دانی پێدانێت، وە ئەمیریش بەڕاستی دابنێ).

–لە دەستوری جەزائیری(١٩٧٦)لە مادەی پێنج هاتووە:(دەسەڵاتی وڵات موڵکی گەلە، وە گەلیش جێبەجێی دەکات لە ڕێگای دەنگدان یان لە ڕێگای هەڵبژاردن).

وە لەمادەی(٧٩)هاتووە:( لە حاڵەتی بەرگری لەشەڕدا کاتێك ماوەی پەرلەمان کۆتایی دێت دروستە بڕیار بە زۆرینەی دەنگەکان بدرێت یان لەسەر فەرمانی سەرۆکی وڵات ماوەکەی درێژبکرێتەوە تاوەکو حاڵەتی بەرگری کۆتایی دێت)[٦٨].

ئا ئەمەیە جاهیلیەتی ئێستایە کە دەسەڵات تیایدا بۆ خوا نییە، یاسادانان بۆ خوا نییە، بەڵکو بۆ سێکوچکە شەیتانیەکەیە، سەرۆکی وڵات–پەرلەمان–گەل! وە ئەمانەش هەرگیز ملکەچی خوا و پێغەمبەرەکەی نین!!!

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تێگەیشتنی دەسەڵات لە بەرنامەکەی پەروەردگار دەبینین خوا دەفەرمووێ: ﴿ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ ﴾واتە:(حوکم تەنها بۆ خوایە) ﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾واتە:(ئاگاداربن دروستکردن و فەرمانکردن بۆ خوایە..) هەموو ئەم ئایەتانە تریش پێمان دەڵێن: تەنها خوا خاوەن دەسەڵات و حوکمە، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی واجبە، وە گوێڕایەڵی هیچ کەسێك ناکرێت لە سەرپێچی فەرمانی خوا.

[٦٨] (راجع نظرية السيادة، للدكتور صلاح الصاوي:٦–١٣–١٤)

مامۆستا(المودودي)دەفەرمووێ:(دەسەلاّت و حوكم تەنها مافی خوایە، یاسادانان تایبەتمەندی خوایە  بۆ هیچ كەسێك نییە–ئەگەر پێغەمبەریش بێت–فەرمان بكات و نەهی بكات بەبێ ئەوەی بەڵگەیەكی پێبێت لەلای خوا، وە كاتێك واجب كراوە لەسەر خەڵك كە گوێڕایەڵی پێغەمبەران بن تەنها بەهۆی ئەوەیە كە هیچ شتێك ناڵێن تەنها سەرچاوەكەی لە حوكمی خوا بونی هەیە،وەك دەفەرمووێ: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾ یان ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴾.

وە بەهەمان شێوە دەفەرمووێ:(تەوحید و یەكتاپەرستی بۆچوونی كردنی مرۆڤەكان بە حاكم ڕتدەكاتەوە، دەیەوێ حوكمێك بێت حوكمێكی دادپەروەر، ئینجا لەسەر كەسێك بێت یان كۆمەڵێك بێت لە كۆمەڵەكان یان ماڵێك لە ماڵەكان یان میللەتێك لە میللەتەكان یان بۆ هەموو كەسێك كەلەسەر زەوی دەژیێت لە نەوەی مرۆڤ....حاكمییەت تەنها ماف و تایبەتمەندی خوای پەروەردگارە هیچ یاسادانەرێك نییە تەنها خوا نەبێت،  وەهیچ حوكمێك نییە تەنها حوكمی خوا نەبێت، وەهیچ دەستورێك نییە تەنها دەستووری خوا نەبێت).

سید قطب دەفەرمووێ:(ئەو دینە بڕیاریداوە كە حەلاڵكردن و حەرامكردن كاری خوایە چونكە یەكێكە لە هەرە تایبەتمەندییەكانی خوای پەروەردگار حەلاڵكردن و حەرامكردنە، وە هیچ كەسێك مافی ئەم دەسەلاّتەی نییە ، خودا بە تەنها شت بۆ خەڵك حەرام دەكات و دەبێت بە حەرام، وە شت بۆ خەڵك حەلاڵ دەكات و دەبێت بە حەلاڵ، بۆ هیچ كەسێك نییە ئەم دەستوورە دابنێ، وە مافی هیچ كەسێك نییە بانگەشەی ئەم تایبەتمەندییە بكات، چونكە ئەمە هاوشێوەی داواكردنی خوایەتییە).

وەدەفەرمووێ:(ئا ئەمە بیردۆزی ئیسلامە لە بواری حەلاڵ و حەرام كە هەموو ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە هیچ بوارێكی ژیانی لێ دەرناچێت...وە بۆ هیچ كەسێك نییە جگە لەخوا شتێك حەلاڵ یان حەرام بكات لە بوارەكانی ژن مارەیی و خواردن و جل و بەرگ و جوڵانەوەكانی مرۆڤ و كار و مامەڵە و نەریتەكان وە هیچ شتێكی تر تەنها بە بەڵگەیەك نەبێت كە لەلایەن خواوە جێگیر بووبێت و لە شەرعدا بوونی هەبێت).

له شوێنێكی تر دەفەرمووێ:(حەڵاڵكردن و حەرامكردن شەریعەت و دینە، ئەگەر ئەو كەسەی شتێك حەڵاڵدەكات  خوا بێت ئەو كات خەڵك لەسەر دینی پەروەردگارن، بەڵام ئەگەر ئەو كەسەی شتێك حەڵاڵ یان حەرام دەكات كەسێكی تر بێت جگە لە خوا ئەو كات خەڵك دینداری بۆ دینی ئەو شتانە دەكەن نەك دینداری بۆ دینی خوا.

تەنها ئەوەندەش ناگرێتەوە كە یاسا و دەستورێك دانێن هاوشێوەی شەریعەتی خوا، بەڵكو هەتا ئەگەر شەریعەتی پەروەردگاریش جێبەجێبكەن بەڵام بیدەنە پاڵ خۆیان نەیگێڕنەوە بۆلای پەروەردگار، وە بەتەنها وە بەتەنهادانانی خوا  بەندەكان ئازاد دەكات لە كۆت و زنجیری یاسا و دەستورەكانی دەسەڵاتداران بۆ جێبەجێكردنی شەرعەكەی خوا و دانان بە دەسەڵاتی لەسەر زەوی).

ئیسلام زۆر گرنگی بەم بابەتە داوە، لە چەندان شوێن گفتوگۆ لەگەڵ نەزانەكان دەكات دەربارەی هەموو ئەو شتانەی حەلاڵ و حەرامیان كردووە...وەك لە ئایەتێك بە ئینكارییەوە دەفەرمووێ: ﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ ﴾ ﴿ قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ ﴾ ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾

ئەم بابەتە بابەتی خوایەتی و تایبەتمەندیەكانیەتی، وە بابەتی دین و تێگەیشتنیەتی، وە بابەتی ئیمان و سنورەكەیتی، بۆیە با موسڵمانان لە هەموو شوێنێك سەیر كەن بزانن كە لە كوێی ئەم بابەتەن؟ لە كوێی ئەم دینەن؟ لەكاتێك بەردەوام بانگەشەی ئیسلامەتی دەكەن!!!).

ئا لێرەوە گرنگە ئەم بابەتە دووبارەی بكەینەوە، بابەتی كوفركردن بە تاغووت و ئیمان هێنان بەخوا، تاوەكو بانگەوازەكە بگات و بەڵگە بچەسپێت و گومان و عوزرەكان نەمێنن و وە نەفسەكان بێ تاوان بن  لەلای پەروەردگار، بۆ ئەوەی ڕێگاكە ڕۆشن بێت بۆ ئەو كەسەی ڕێگای هیدایەت دەگرێتە بەر یان  گومڕایی.

له شەریعەت چەسپاوە و لە شتە زانراوەکان کە خوا دەسەلاّتی دروستکردن و فەرمانکردنی هەیە، وەك دەفەرمووێ: ﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ ﴾ وە(أمر)فەرمانکردن دوو شێوەیە:

یەکەم:أمر كوني: تایبەتە بە بەڕێوەبردنی کاروباری دروستکراوەکان، ئەوەی کە دەڵێت:(کن فیکون) ببە بووە.

دووەم:أمر شرعي:ئەوەیە کە حەلاڵ و حەرامەکان ڕوون دەکاتەوە، بۆ هەموو بوارەکان لەسەر ژیانی مرۆڤ.

شتێکی شاراوە نییە کە لە مێژووی جاهیلیەتی پێش ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) تۆمارنەکراوە کە هیچ کەسێك بانگەوازی ئەوەی کردبێت کە خاوەنی بوونەوەر بێت و دروستکراوێکی تر هەبێت لە غەیری خوا، بەلاّم بە پێچەوانەوە وتەی بەشێك لە تاغووت و ستەمکار و گەورە و خواپەرستەکان تۆمارکراوە کە ململانێ لەگەڵ خوا دەکەن لە فەرمانە شەرعییەکان، بانگەشەی ماڧ فەرمان و نەهی کردن و یاسادانان بۆخۆیان دەکەن، بۆیە حەلاّڵەکانی خوایان حەڕام کرد وە حەڕامەکانیان حەلاّلکردووە.

دواتر جاهیلیەتی سەردەم هات کە سەرکردەکان بەڕێوەی دەبەن یان ئەو کەسانەی کە ماڧ تەشریعدانانی بەڕەوا دادەنێن بۆ خۆیان، ماڧ دانان و دەرکردنی یاسا، وە ماڧ ڕەخنەگرتن و بەڕاستدانان،ماڧ حەلاّلکردن و حەڕامکردن، ئەم ماڧانەیان گواستۆتەوە بۆ ئەندام پەرلەمان و گەل و میللەت و پەرلەمان و دەستوورە کۆنەکان، ئا بەمە کردارە دژایەتی پەروەردگاریان کرد لە تایبەتمەندییە هەرە دیارەکانی!.

هیچ گومانی تیا نییە کە بەتاك دانانی خوا لە حوکم وەکو بەتاك دانانییەتی لە دروستکردن، بەتاك گرتنی خوا لە فەرمانی شەڕعی وەکو بەتاکگرتنی خوایە لە فەرمانی بوونەوەر، بۆیە دەرچوون لەهەر یەکێکیان ڕوودات ئەوە هاوبەشدانان و دژایەتی کردنی خوایە، خوا دەفەرمووێ:(إن الحُكم إلا لله أمَر ألاّ تعْبدوا إلا إياه ذلك الدين القَيم).

ئا بەم شێوە قێزەون و ناشیرنە دەسەلاّتدارە بێ بڕواکان ڕای دەگەیەنن–وەکو باسمان کرد– کە ماڧ یاسادانان بۆ غەیری خوایە تاوەکو وای لێهاتووە دەقە شەڕعییەکان لەلایان ماڧ

یاسایی وەرناگرێت ، تەنها  لەلایەن ئەو کەسە نەبێت کە یاسا و دەستور دەردەکات، بەڵام لەلایەن خواوە سیفەتی یاسایی نییە چونکە پەروەردگار  سەرچاوەی دەسەڵات نییە و مافی یاسا دانانی نییە لەلای ئەم جۆرە کەسانە!!! سبحان الله خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِي ٱلزُّبُرِ ﴾.

بەم شێوەیە بۆت روون دەبێتەوە و گومان و دوودڵیەکان  لە بیرو هیزرت لادەچێت، هیچ شوێنێك نامێنێت لە عەقڵت کە ئەهلی باتڵ لێت تێکەڵ بکەن یان زانای دەسەڵاتدارەکان، یان شوڕتە  و بن دەستی سەرکردەکان کە پارێزگاری لە تاغوتەکەیان دەکەن، بۆیە زۆر ئاگاداربە بەناو و شتە ڕازێندراوەکان هەڵنەخەڵەتێی چونکە ئەم سەردەمە سەردەمی هەڵهخەڵەتاندنە بە هەموو جۆرەکان لە ڕێگای ڕاگەیاندنەکانەوە بێت یان لە ڕێگای زانا خۆفرۆش و دینە فرۆشەکانەوە بێت، بۆیە ئێمە چەند نموونەیەك لە حەلاڵکردن و حەڕامکردن  و کوفر و شیرك دەخەینە بەردەست بۆ ئەوەی لەسەر چاوڕۆشنی بیت و هەڵنەخەڵەتێی.

*چەند نموونەیەك لە حەلاڵکردن و حەڕامکردنی تاغوتەکان لە جاهیلیەتی ئێستا:

مانای حەلاڵکردن:

حەلاڵکردن(تحليل)لە زوبانەوانی دژی حەڕامکردنە(تحريم) ، دەوترێ(استحل الشيء) واتە:حەلاڵی کرد،(حلَّل الشيء–أحلّ الشيء)واتە:ڕێگای پێدا، خوا دەفەرمووێ:(وأحلَّ الله البيْع وحَرم الربا)، وە خودا دەفەرمووێ:(يأيها الناسُ كلوا مِما في الأرضِ حلالاً طيباً)، وە لە فەرموودە هاتووە:(الحلال ما أحلَّه الله في كتابه)واتە:(حەلاڵ ئەوەیە کە خوا لە کتێبەکەی حەلاڵی کردووە)، دەوترێ:أحل:دەرچوو لە ژێر ئیحڕام، ئەو شتەی پێشتر لێی قەدەغە کرابوو ئێستا بۆی دروستە.

وە لە ڕاڤەی وشەی(استحل)لە(معجم الوسيط)هاتووە:( استحل فلان فلانًا الشيء) واتە:(داوای کرد کە فلان شتی بۆ حەلاڵ بێت) وە الف و سین و تائی(استحل)کە زیادبوە بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕە بەشتێك، وەك:(استكرمته) واتە:بیروباوەڕی وایە کە ڕیزی هەیە.

وه(ابن منظور) باسی کردووه:(استحل فلان الشی)واته:حه‌لاڵی کرد، ئه‌م سیٚ پیته‌ی زیادبووه بۆ کردن و بوونی شتێکه، وه‌کو(استعبد فلان فلانا)واته:کردی به کۆیله، (استأجره)کردی به کرێ، وه‌ئه‌مه ئه‌و مانایه‌یه که‌(فیروز آبادي)باسی کردووه که به مانای گۆڕینی و کردنی شتێك دێت[69].

ئا لێره بۆمان ڕوون بۆوه که ووشه‌ی(استحل)و(استحلال) له زوبانی عه‌ره‌بی به‌م سیٚ مانایه دێت:داواکردنی شتێك که بکرێ به حه‌لاڵ، وه به‌مانای: بیروباوه‌ڕبوون که شتێك حه‌لاڵه، وه به‌مانای:کردنی شتێك به حه‌لاڵ.

مانای حه‌ڕامکردن(التحریم):

حه‌ڕامکردن پێچه‌وانه‌ی حه‌لاڵکردنه، وه وشه‌ی حه‌ڕام واته:(الممنوع من فعله) واته: ڕێگری له کردنی شتێك، ئینجا ئه‌م ڕێگرییه یان سروشتی خواییه یان ڕێگری خودی مرۆڤه‌کانه یان ڕێگرییه له‌لایه‌ن عه‌قڵ و ژێری مرۆڤه‌وه یان له‌لایه‌نی شه‌ڕعه‌وه‌یه.

وه هه‌ر حه‌ڕامدانانێك له لایه‌ن غه‌یری خواوه بێت ئه‌وه هیچ نییه(الحرام ما حَرم الله في كتابِه)واته:(حه‌ڕام ئه‌وه‌یه که خوا له کتێبه‌که‌ی حه‌ڕامی کردووه)[70].

ئینجا تاغوتانیش هاتوون حه‌ڕامه‌کانی په‌روه‌ردگاریان حه‌لاڵکردووه، وه حه‌لاڵه‌کانیان حه‌ڕام کردووه—ان شاء الله—ئه‌و حوکمانه ده‌هێنینه‌وه که تاغوتان حه‌لاڵ و حه‌ڕامیان کردووه وه‌کو چه‌ند نموونه‌یه‌ك که پێچه‌وانه‌ی شه‌ریعه‌تی ئیسلامه، وه‌ك ئه‌مانه‌ی خواره‌وه:

یه‌که‌م: زینا:

پێناسه‌ی زینا لای مالیکیه‌کان: (بأنه وطء مكلف فرج آدمي ، لا ملك له فيه باتفاق تعمدًا) لای حه‌نه‌فییه‌کان:(بأنه وطء الرجل المرأة فى القبل فى غير الملك وشبهة الملك)

[69] (راجع موسوعة الفقه الإسلامي:١٠٦/١)

[70] (راجع القاموس الفقهي لغة واصطلاحا:٨٥)

لای شافیعییەکان:(بأنه إیلاج الذکر بفرج محرم لعینه خال من الشبهة مشتهي طبعًا)
لای حەنبەلییەکان:(بأنه فعل الفاحشة فی قبل أو دبر)[71]

<u>پوختەکەی</u>:جووت بوونی پیاوە لەگەڵ ئافرەت.

وە سزاکەی لە شەریعەتی ئیسلام ئەگەر(محصن)نەبێت –واتە:کوڕە ژنی نەهێنابێت و کچە مێردی نەکردبێت– ئەوا سەد جەڵدە لە هەر یەکێکیان دەدرێت،وەکو خوا دەفەرمووێ:(الزانِیة والزَّانِي فاجْلدوا کُل واحِد مِنهُما مِئةَ جلْدَة).

وە ئەگەر(محصن)بێت–واتا پیاو ژنی هەبێت و ژنەش مێردی هەبێت– ئەوە ڕەجم دەکرێن بە بەرد، وەکو لە فەرموودە هاتووە لە فەرموودەی(العسیف)کە زینای لەگەڵ ئافرەتێکی مەخزومی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:( واغد یا أنیس علی امرأة هذا فإن اعترفت فأرجمها ) واتە:(ئەی أنیس برۆ لای ئافرەتەکە ئەگەر دانیپێدانا ئەوە ڕەجمی بکە) أنیس چوو بۆ لای ئافرەتەکە و دانی نا بەتاوانەکەی و ڕەجمی کرد.

بە هەمان شێوە بەسەرهاتی(الغامدیة)دانینا بەوەی کە زینای کردووە، وە(محصن)بوو و ڕەجم کرا.

وە بەسەرهاتی (ماعز)کە لەلای پێغەمبەر(ﷺ)دانینا بە زیناکردن، پێغەمبەریش فەرمانی کرد بە ڕەجمکردنی.

کە ئەمە زینابێت لە حوکمی خوا، وە ئەمە سزا دیاریکراوەکەی بێت، با بزانین پێناسەی زینا لەلای تاغوتەکان چییە؟ وە سزا دیاریکراوەکەی چییە؟

پێناسەی زینا لە یاسا و دەستووورە جاهیلیەکانی ئێستا بریتیە:

لەو پەیوەندییە جنسیەی کە لەنێوان دوو ڕەگەز ئەنجام دەدرێت، وە ئەو جووت بوونە ڕێگەپێدراوە تا بێ زۆرلێکردن بێت، وە بە ڕەزامەندی هەردوولا بێت لە نێر و مێ کە زەواجیان نەکردووە وە تەمەنیان لە سەرووی هەژدەساڵە. مادەی(٦٩) لە (عقوبات القانون المصري).

---

[71] (راجع تشریع الجنائي، لعبد القادر عودة:٣٤٩/٢)

له یاسای کوێتی له مادەکانی(١٨٩–١٩٠–١٩٤)له یاسای سزادان له بنچینەی(٣٢) لەدەستپێکی (٥٩)هاتووە:(هەرکەسێك بچێت بۆلای ئافرەتێك که تەمەنی گەیشتبێتە هەژدە ساڵ و بە ڕەزامەندی خۆی بێت سزا نادرێ ).

له قانونی لیبی له مادەکانی(٣٩٩–٤٠٢)هاتووە:

یەکەم:أن جريمة الزنا ليست من حق الله... تاوانی زینا له مافەکانی خوا نییە، وە مافی کۆمەڵگاش نییە، بەڵکو مافی پیاو و ئافرەتەکەیە، وە هیچ نوێنەرایەتیك کاری پێناکرێ تەنها ئەگەر یەکێك له دوو لایەنەکە سکاڵای هەبێت دژی ئەوەکەی تر).

دووەم:سزای زینا دەکەوێت لەسەر کەسێك ئەگەر سکاڵاکار سکاڵاکەی بکێشێتەوە دژی ئەوەکەی تر ئەگەر له پاش دەرچوونی حوکمی کۆتایش بێت بۆ تاوانبار به سزادان، وە ئازاد دەکرێت.

سێیەم: ئەگەر ئافرەت زینا بکات بەڵام مێردەکەی له پێنج ساڵی ڕابردوو کەوتبێتە ناو زینا، ئەوە مێردەکە مافی سکاڵای نییە دژی ئافرەتەکە، بەهەمان شێوە ئافرەت مافی سکاڵای نییە دژی پیاوەکەی که زینای کردووە لەکاتێك خۆی له پێنج ساڵی ڕابردوو کەوتۆتە ناو زیناوە.

وە له قانونی مصری له مادەی(٧٣)هاتووە:(نابێت لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئافرەت بکرێت که زینای کردووە تەنها ئەگەر مێردەکەی سکاڵای لێبکات، وە ئەگەر مێردەکەشی زینای له هەمان ئەو شوێنە کردبێت که تیایدا نیشتەجێیە ئەوە مافی سکاڵای نییە).

ئەمە چەند نموونەیەکی کەمە، ئەو کەسەی دەیەوێ زیاتر بخوێنێتەوە با سەیری(موسوعة القضاء والفقه للدول العربية)بکات که سەد و پێنج موجەلەدە، وەجگە لەمەش له سەرچاوە یاسا دانراوەکان.

ئەو سزا دیاریکراوەی بۆ زینا دانراوە لە یاسا و دەستووری جاهیلیەتی ئێستا:

ئەو سزایانەی کە بۆ زینا دانراوە بەم شێوەی خوارەوەیە:

١-ئەنجامدانی ئازادی جنسی لە غەیر سنووری یاسا کە ڕێگری لێناکات وەکو شکاندنی نامووس بە ڕەزامەندی هەردوو لا کە تەمەنی گەیشتۆتە هەژدە ساڵ ئەوە لە قانوندا سزا نادرێت[٧٢].

کەواتە بە گشتی بە یاسا و دەستورەکان زینایان حەلاڵ کردووە لە کاتێکی دیاریکراو، وە هیچ سزایەکی لەسەر نییە ئەگەر بە زۆر نەبێت و تەمەنیان بچووك نەبێت.

٢-سزای مێردی زیناکار لە قانونی میصری-وە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی-وەکو لەمادەی(٢٧٧)هاتووە:(زیندانی دەکرێت زیاتر نەبێت لە شەش مانگ، وە سزای ئافرەتی زیناکار زیندانیە کە زیاتر نەبێت لە دووساڵ).

٣- وە یاسای لیبی بەشێوەیەکی گشتی یەك شتە کە ئەویش ڕێپێدانی زینایە لە زۆربەی کاتەکان، وەسزاکەی لەمادەکانی(٤٠٧-٤٠٨)هاتووە:(کەوتنە ناو زینا و شکاندنی ناموس هیچ سزای لەسەر نییە ئەگەر لە نێوان پیاو و ئافرەتێك ڕوویدات، بە ڕەزامەندی هەردوو لابێت، بەڵام ئەگەر بەبێ ڕەزامەندی لایەنێك بێت لایەنەکەی تر هێز و هەڕەشە بەکاربهێنێ یان بە ڕێگای فێڵ و تەڵەکە بێت ئەوە سزاکەی زیندانیە)[٧٣].

٤-وە لەمادەی(١٣٨)لە(موسوعة القضاء والفقه للدول العربية)هاتووە:(سزادەدرێ بە زیندانی کە نابێت لە دوو ساڵ زیاتر بێت، یان بەسزای ماددی کە لە سەد جونەیهی زیاتر نەبێت)[٧٤].

٥-لەهەمان موسوعە لەژێر مادەی١٣٢-دەستدرێژی کردنە سەر مێینە-هاتووە:(سزا دەدرێ بە زیندانی کە لە دوو ساڵ کەمتر نەبێت، وە لە حەوت ساڵ زیاتر نەبێت بۆ ئەو کەسەی بچێتە

---

[٧٢] (مقدمة في فقه الجاهلية، لأستاذ يس عبدالجواد:١٢٣)

[٧٣] (الشريعة الإلهية لا القوانين الجاهلية، للدكتور عمر الأشقر:٨٠-٨١)

[٧٤] (موسوعة القضاء، مجلد:٩١).

لای ئافرەتێك بەبێ ڕەزامەندی ئو، وەسزاکەی دەبێت بە زیندانی ئەگەر تەمەنی نەگەیشتبێتە چواردە ساڵی، یان بە دووکەس بچنە سەر یەك ئافرەت...).

٦–لە مادەی(٣٣٩)لە یاسای(عقوبات الجزائري)هاتووە:(سزای زیندانی ساڵێك بۆ دووساڵ لەسەر هەر ئافرەتێکە کە شووی کردبێت و زینای لەسەر بچەسپێ، وە جێبەجێکردنی ئەم سزایە لەسەر هەرکەسێکە کە بکەوێتە ناو زینا لەگەڵ ئافرەتێك کە شووی کردبێت، وە بەهەمان شێوە پیاویش سزای ساڵێك بۆ دووساڵ زیندانی لەسەرە کە بکەوێتە ناو زینا، وە ئەم سزایانەش ئەنجام نادرێت تەنها لەسەر سکاڵای مێردەکە نەبێت کە زەرەلێکراوە).

ئێمە ئەو کوفر و بێدینیە بە دوور نابینین لە نەوەکانی(جەنگیز خان)و(مصطفى أتا تورك)، بەڵام پێمان سەیرە لەو کەسە هەست ناسك و خۆپارێزانەی کە بەردەوام پشتیوانی لەو تاغوتانەی سەردەم دەکەن، پێیان دەڵێین: ئەمە بریتی بوو لە ڕاستی یاسا و دەستورە دانراوەکان کە سەرکردە و دەسەڵاتدارەکان کاری پێ دەکەن بە شەو و بەڕۆژ لەبەرچاوی هەمووومان ئایا بە ئاگانایەن تاکەی ئەم تاغوتانە بە وەلی ئەمری موسڵمانان دادەنێن؟!.

لە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی موسڵمان جێگیر بووە:کە کەسێك یەك بابەت بگۆڕێت لە شەریعەتی ئیسلام ئەوە کافر دەبێت و لە ئیسلام دەردەچێت، باشە دەبێت حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت مافی یاسادانان و تەشریع لەخۆی ببینێ و ئەم مافەی خوا زەوت بکات؟! لەلایەن پێغەمبەری ڕاستگۆوە بەرنامەیەکی ڕۆشنمان بۆ هاتووە، لە(براء بن عازب)هاتووە:کە یەهوودیەك بەلای پێغەمبەر(ﷺ)تێپەڕی کە یەهودیەکی تری لەلابووە ڕووی ڕەشکردبوو و جەڵدەی لێدەدا، پێغەمبەر(ﷺ)بانگی کردن فەرمووی:ئایا سزای زینا لە کتێبەکەتان ئاوا هاتووە؟ وتیان:بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ)بانگی یەکێك لە زاناکانیانی کرد فەرمووی:سوێندت دەدەم بەو خوایەی کە تەوراتی بۆ موسا دابەزاندووە ئایا سزای زینا لە کتێبەکەی ئێوە بەم شێوەیە؟ ووتی:ئەگەر سوێندت نەدابام بەخوا ئەوە پێم ڕانەدەگایاندی، لە دینەکەی ئێمە سزاکەی ڕەجمە بەڵام زینا لەناو گەورە و پیاوماقوڵانمان زۆر بوو، هەر کاتێك کەسێکی دەسەڵاتدار زینای دەکرد وازمان لێ دەهێنا وە ئەگەر کەسێکی لاواز کەوتبا ناو ئەم تاوانە ئەوە سزاکەمان لەسەر جێبەجێ دەکرد، بۆیە لەنێوان خۆمان وتمان:با بێین کۆببینەوە

لەسەر شتێك –لە ڕیوایەتێکر تر–: با سزایەك بۆ ئەم تاوانە دابنێین کە بۆ گەورە و بێ دەسلاتەکان بگونجێ و جێبەجێبکرێت بۆیە ڕووڕەشکردن و جەلدەمان لە شوێنی ڕەجم دانا !پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی : خودایە ئەوا من یەکەم کەسم کە فەرمانی تۆ زیندوو دەکەمەوە کە مراندوویانە، فەرمانی کرد و ڕەجم کرا، خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ ﴾

دەڵێن:بڕۆن بۆلای محمد ئەگەر فەرمانی پێکردن بە ڕووڕەشکردن و جەڵدە ئەوە وەریگرن، وە ئەگەر فەرمانی کرد بەڕەجم  ئەوا ئاگادار بن! خوداش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾

هەموو ئایەتەکە لەسەر بێبڕوایان[٧٥].

ئینجا ئەی برای موسڵمان بیربکەوە لە وتەی گاورەکان کە وتیان: وەرن با کۆببینەوە لەسەر شتێك، وە لەڕیوایەتەکەی تر:سزایەك دانێین کە بگونجێ، بە گومانی خۆیان زینایان حەرام کردووە بە حەرامبوونی تەورات بەلاَم تەنها سزاکەیان گۆڕی لە ڕەجمەوە بۆ ڕوو ڕەشکردن و جەلدە لەگەلْ ئەمەشدا لەناخیانەوە هەست بەتاوان دەکەن بۆیە لەنێوان یەکتر دەڵێن:بڕۆن بۆلا موحەممەد ئەگەر فەتوای هەرشتێکتان بۆ بدات ئەوە بەڵگەیە بۆتان لەلای خوا.

بۆیە زانایان دەفەرموون:(یەهوود کاتێك حوکمی زینایان لە ڕەجمەوە گۆڕی بۆ ڕووڕەشکردن و جەڵدە، لەناخیانەوە خۆیان بەتاوانبار دەزانی و بەدوای بەڵگە و دەرچەیەك دەگەڕان، بۆیە لەنێوا خۆیان دەیان ووت: بڕۆن بۆلا موحەممەد چونکە بە ئاسانکاری نێردراوە ئەگەر فەتوای ڕووڕەشکردن و جەڵدەتان بۆ بدات ئەوە بەڵگەیە بۆتان لەلای خوا(وإن لم تؤتوه فاحذروا)[٧٦]

---

[٧٥] (أخرجه مسلم في كتاب الحدود:١٧٠.

[٧٦] (راجع حد الإسلام، لعبد المجيد الشاذلي:٣٨١-٣٨٤ ).

باشه خودا حاڵی یەهوودیەکانمان بەو شێوەیە بۆباس بکا کە یەك حوکمی خوایان گۆڕی،هەمووی‌ان پێکەوە کافربوون ، دەبێ حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت کە چەندین حوکمی خوایان گۆڕیوە و دژایەتی ئەو کەسانەش دەکەن کە باس لە حوکمی خوا دەکەن، یەهوود کاتێك حوکمی خوایان گۆڕی لەناخیانەو خۆیان بەتاوانبار دەزانی بەڵام تاغوتانی ڕۆژگاری ئەمڕۆ یاسا و دەستورەکانی خۆیان پێ باشترە لە قورئان و سوننە و قورئانەکەی خوا بە دواکەتوویی و نەزانی وەسف دەکەن، بەڵام ئەم شتانەمان پێ سەیر نییە لە تاغوتانێکی ئەم سەردەمە، بەڵکو سەرسوڕمانی لەو کەسەدایە کە موسڵمانە و دەڵێ:(لا اله الا الله) کەچی ئەم تاغوتانە بە موسڵمان و وەلی ئەمر دەزانێت وە ئەو کەسانەی باسی ئەم شتانەش بکەن لەلایان پێیان وایە کەسێکی گومڕا و تەکفیرییە.

کەواتە برای هاودینم با گشت مانای بەندایەتی بۆخوا جێبەجێبکەین و دووركەبوینەوە لە هەموو جۆرەکانی تاغووت

دووەم:سزای دزی کردن:

شەرعزانان پێناسەی دەکەن بە:( أخذ مال مستترًا من غير أن يؤتمن عليه)واتە:(بردنی ماڵێکە بە شاراوەیی بەبێ ئەوەی هیچ مافێکی لەسەر هەبێت)یان: ( أخذ البالغ العاقل نصاب القطع خفية من المتمول للغير من حرز بلا شبهة ) واتە:(کەسێکی باڵغ و عاقڵ بەشێك لە ماڵێك ببات بە شاراوەیی کە لەشوێنێکی پارێزراو هەڵگیراوە بەبێ بوونی هیچ گومانێك).

وە سزای دز لە شەریعەتی ئیسلام:

خوا دەفەرمووێ:(والسارِقُ والسارِقَةُ فاقْطَعوا أيْدهُما جَزاء بِما كَسَبا نكالاً مِن الله والله عَزيزٌ حَكيم)ئەمە دەقێکە جێگیر بووە لە ئیسلامدا، وە سوننەی پێغەمبەر(ﷺ)دیاری کردووە کە لە مەچەکەوە دەست ئەبڕێتەوە ئەگەر ئەو مەرجانەی کە لە شەرعدا دیاریکراوە بێتەجێ.

بەڵام سزای دزیکردن لە یاسا تاغوتییەکان : بنچینە لەدزیکردن تاوانە و سزا دەدرێ بە زیندانی کردن کە لە دووساڵ یان سێ ساڵ زیاتر نەبێت، لە مادەی شەیتانی بە ژمارە(١٤١)لە (قانون الدول العربية) هاتووە:(ئەو کەسەی دزی کردووە سزا دەدرێ بە زیندانیکردن کە لە سێ ساڵ زیاتر نەبێ).

وە زیادڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین: هێندێك لەوپارێزەرانەی تاغوتان واگومان دەبەن کە ئەو دەسەڵاتدارەکەی دەستی دز دەبڕێت وەلی ئەمرە و بەیعەت دان پێی واجبە، ئەگەر بچێت دۆستایەتی ڕۆئاوا و کوفریش بکات یان شەریعەتی خوا بگۆڕێت و شوێن یاسا دەستکردەکان بکەوێت لە بوارەکانی تری ژیان!! بەهەموو ئەم کەسانە دەڵێین:دەگوێ بگرن بزانن(ابن کثیر)باسی جاهیلیەتی سەرتا دەکات چی دەڵێت:

دەفەرمووێ:(دەست بڕینی دز لە جاهیلیەتی سەرتا کاری پێدەکرا، دواتر کە ئیسلام هات دانیپێدانا و چەند مەرجێکی تری بۆ زیاد کرد، وە چەندین بابەتی تر کە لە جاهیلییەت بوونی هەبووە و شەرع دانی پێداناوە، وەکو بابەتەکانی دیە و قەرز دابەشکردن کە وەکو خۆی ماوەتەوە چونکە سوودی گشتی تێدایە بۆ مرۆڤەکان) .

وەدەفەرمووێ:(یەکەم کەس کەدەستی دزی بڕی لە جاهیلیەت قوڕەیش بوو، دەستی پیاوێکیان بڕی کە پێی دەوترا(دويك مولى لبني مليح بن عمرو بن خزاعة)کە گەنجینەی کەعبەی دزی بوو)[77].

ئایا مافی ئێمە نییە کە پێمان سەیر بێت کەسێکی خاوەن ڕیش دوورکەوتۆتەوە لە بەدواداچون و خوێندنی بابەتی حاکمیەت و یاسا و تەشریع دانان لە جاهیلییەتی ئێستا، پێیان دەڵێن:هیچ جیاوازییەك نییە لە دینی خوا لە نێوان کافرکردنی خاوەن شیرکی گۆڕپەرست و کافرکردنی شیرکی کۆشك پەرستەکان!!! حاڵیان وەکو ئەوە وایە بڵێن: پێویست نییە لەم ڕۆژگارەدا ئەم بابەتانە باس بکرێت!!مالايدرك جله لا يترك كله!!

---

[77] (تفسير ابن كثير:٢/٥٧)

وە ئەم ئایەتەی خوایان بەیاد دەهێنمەوە: ﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾.

سێیەم:سزای ئارەق(مەی):

خواردنەوەی ئارەق لە شەرعدا یەکێکە لەو تاوانانەی کە شەرع سزای بۆ داناوە، وە لەو تاوانانەیە کە خوا زۆر بە گەورە باسی کردووە و زۆر ترسناکە، وە سزاکەی روون کراوەتەوە بۆ هەموو رۆژگارێك بە شێوەیەکی بەردەوام.

(أصحاب السنن)گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ:(من شَرب الخمر فاجلدوه، ثم إن شرب فاجلدوه، ثم إن شَرب فاجْلدوه، ثم إن شرب الرابِعة فاقْتلوه)[78] واتە: (هەرکەسێك مەی خواردەوە جەڵدەی لێبدەن، ئەگەر دووبارە خواردیەوە جەڵدەی لێبدەن، ئەگەر دووبارە خواردیەوە جەڵدەی لێبدەن، ئەگەر جاری چوارەم خواردیەوە بیکوژن).

زانیمان کە ئەمە سزای مەیخۆرە لە شەریعەتی خوا، با بزانین لە یاسا تاغوتیەکان حوکمی مەی خۆر چییە؟؟!!

وەڵامەکەی ڕون و ئاشکرا!!کەئەویش حەڵاڵکردن و ڕێگا بۆ خۆشکردن و حەلاڵکردنی حەرامکراوەکان لەسەر زەوی خوا و دروستکراوەکانی خوا، بەڵکو بەمەش نەوەستان یاسایان دەرکرد کە پارێزگاری لە شوێنی مەی فرۆشتن دەکات.

لە مادەی یازدە بە ژمارە(٣٩٤)هاتووە:(چەك هەڵگرتن لە شوێنە گشتییەکان دروست نییە وە لەو شوێنانەی کە ئارەقی تێدا پێشکەش دەکرێت، وە لەو شوێنانەی کە قومار و گەمەی تێدا دەکرێ).

وە لە (قانون المسكرات)(١٥٦)لە وڵاتی بەحرێن هاتووە:(ئێمە وەکو دادوەرانی وڵاتی بەحرێن و دەوروبەری ئەمرۆ چەند یاسایەك دادەنێن لە یاساکانی(قانون المسكرات)بەم شێوەیە:

---

[78] (سنن الترمذي)

١–هەمو کەسێك ئەم یاسایەی لەسەر جێبەجێدەبێت کە ئارەق دروست بکات و بیهێنێت بۆ بەحرێن مادده سەرخۆشکەرەکان جگە لەو مەشروباوەنەی کە جیکراوەتەوە لە یاسا کە بەکاردەهێنرێ، کەوتۆتە ناو تاوان سزاکەی زیندان کە لە سالێك زیاتر نەبێت، یان سزابدرێ کە لە هەزار روبیە زیاتر نەبێت یان هەردوو سزاکە.

٢–هەموو کەسێك ئەم یاسایەی لەسەر جێبەجێدەبێت کە لە حاڵەتی سەرخۆشییە، یان خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەر بخواتەوە، ئەوە تاوانی کردووە سزا دەدرێت بەزیندانی کە لە شەشە مانگ زیاتر نەبێت.

٣–هیچ ڕێگرییەك نییە لەم یاسایە لە هێنانی هەر ماددەی سەرخۆشکەر،پارێزگاری کردنی لە کۆگان یان لە دوکان وە حکومەتی بەحرێن ئەم یاسایە جێبەجێ دەکات لەسەر خەڵك و دانیشتوانیش پێویستە گوێڕایەڵ بن بۆ ئەم یاسایانە ! !.

هیچ شتێکی شاراوە نییە لە حوکمەکانی شەریعەت کە تەنها خوا مافی فەرمانکردن و ڕێگریکردن و دانانی یاسا و تەشریعی هەیە هەرکەسێك ململانێ بکات لەم مافەی خوا ئەوە لە ئیسلام دەردەچێت هەرکەسێك بێت ئەگەر نوێژیش بکات و بەڕۆژیش بێت و واگومان ببات کە موسڵمانە ! ! !

لەم لایەنەوە واپێویست دەکات باسی جیاوازییەکی سادە بکەین لە نێوان پێناسەی حوکم،وە حاکم کێیە؟وە حوکم لەسەر دراو لە شەریعەت..هەموو ئەمانە لەیاسا جاهیلیەکان باس دەکەین، تاوەکو ئەم بابەتە زیاتر ڕوون بێتەوە، چونکە بابەتێکی ترسناك و گرنگە هیچ بوارێکی بۆ عاتیفە تیا نییە یان دوورەپەرێزی و دەمارگیری.

له زانستی (أصول الفقه) جێگیر بووه بەم شێوەیە:

١-الحاكم:كە خوای پەروەردگارە.

٢-الحكم: پەیامی پەروەردگارە کە پەیوەندی بە کردەوەکانی مرۆڤەوە هەیە ئینجا بەشێوازەکانی: فەرمان(إقتضاء)،یان بە شێوەی سەرپشکی(التخیر)،کە پێنج حوکمەکە دەگرێتەوە:واجب-سوننەت-حەڕام-مکروهـ-مباح.

یان بەشێوەی دانان(الوضع):دانانی شتێك بۆ ناسینەوەیی ئەم پێنج حوکمەی سەرەوە،کە شتێك ببێت بە هۆکار(السبب)، یان ببێ بە مەرجێك(الشرط)، یان ببێ بە ڕێگری(المانع)، یان ببێ بە تەواوی(الصحیح)، یان ببێ بە خراپی(فاسدا).

١-المحكوم فیە:کردەوەی مرۆڤەکانە کە پەیوەندی بە حوکمەکە هەیە.

٢-المحكوم علیە:خودی مرۆڤەکەیە کە حوکمەکە پەیوەندی بەکردەوەکەی هەیە.

بەم شێوەیە جیاکاریەکان لە شەریعەتی پەروەردگارە ڕوون کراوەتەوە، بەڵام لە یاسا دەستکردەکان بەم شێوەیە:

١-الحاكم:کە بریتییە لە سەرکردەی دەوڵەت یان مەلیك یان گەورەی وڵات یان ئەندام پەرلەمان یان ڕێکخراوە ناوخۆییەکان.

بۆیە بە کوفر و ناشیرینیەك کاتێك دەستورێك دادەنێن دەڵێن:ئەمڕۆ بڕیار دەدەین بە فلان شت و فلان شت یان ئێمە وەکو بنەماڵەی فلان بڕیارماندا بەمە یان فەخامەتی سەرۆك بڕیاریدا بە فلان شت وە فلان شتیشی قەدەغە کرد یان کۆمکاری عەڕەبی فلانە شت حەڕام دەکات..وە فلانە شت حەلالدەکات یان بە شێوەکانی تر.

٢-الحكم: ئەو یاسا و دەستورانەیە کە هاتوون وەکو سیاسەتێك بۆ ئەوەی لە خەڵکی بشێوێنن یاساکانیان ناوناوە بەهەمان ئەو ناوەی کە موسڵمان بۆ حوکمی خوا بەکاری دێنێ لە واجب کردن و سوننەت و حەڕام و مەکروهـ و مباح و مەرج و ڕێگری و تەواوی و ناتەواوی....

بۆ زیاتر ڕوونبونەوەی ئەم بابەتە لەکاتی دەرکردنی یاسا و دەستورەکان سەیریان کە ئەم ووشانە بەکاردەهێنن:حەڕامە یان دروست نییە یان واجبە یان یاسا چەسپاندوویەتی یان دروستە یان یان ڕێگاپێدراوە.

هێندێك شاهێدی لە یاساكانی خۆیان وەكو بەڵگەیەك لەسەریان كە ئەم ووشانە بەكاردەهێنن:

– لە مادەی(١١١)هاتووە:( يجوز للعاقدين أن يتفقا على سعر آخر للفوئد...).

– لە مادەی(٢٣)هاتووە:( لا يجوز لغير الكويتي الإشتغال بالتجارة في الكويت إلا إذا كان له شريك أو شركاء كويتيون).

– لە مادەی(١)هاتووە:( لا يجوز لغير القطريين سواء أكانوا أشخاص طبيعيين أم اعتباريين أن يكتسبوا في قطر بعد نشر هذا القانون ملكية أية أموال تابثة يشمل ذلك ملكية أية أرض وكذلك أية مبان من أي نوع كانت أو غيرها).

– لە مادەی(١٤)هاتووە:( لا يجوز أن يلمس العلم الوطني أو العلم الخاص بجلالة الملك سطحي الأرض والماء).

– لە مادەی(٤٠٩)هاتووە:( يجب بيان سعر الفائدة في الكمبيالة ذاتها وإلا كان الشرط باطلاً).

– لە مادەی(٥٩)هاتووە:( يجب على الفرد الولاء التام للملك ، والمحافظة على مصالح الوطن والقوات العسكرية، وأن يعمل دون إهمال على تطبيق النظم واللوائح المعمول بها، وتنفيذها ، وتحاشي أية مخالفة ، أو خرق لها).

– لە مادەی(٧٣)هاتووە:( لا تجوز محاكمة الزانية إلا بناء على دعوى زوجها ، إلا أنه إذا زنى الزوج في المسكن المقيم فيه مع زوجته لا تسمع دعواه عليها).

– لە مادەی(٥٩)هاتووە:( يحظر على الأفراد الزواج من غير السعودية).

– لە مادەی(٢٦)هاتووە:( لا يعد الفعل جريمة عند قيام سبب من أسباب الإباحة).

– له مادەی(٣٠)هاتووە:( تحظر جميع الجمعيات والجماعات والهيئات التي يكون غرضها العمل على نشر مبادىء ترمي إلى هدم النظم الأساسية) دەقی ئەم دەستوورە مەبەست پێی موسڵمانانە ئەو موسڵمانە ڕاستەقینانەی کە دژایەتیان لەگەڵ دەکەن لەسەر ئەو حەق و مافەی خوا کە داگیریان کردووە، وە ڕوخاندنی ئەو ڕێچکە کوفرییە تاغوتانەی کە دایانناوە، وە چەسپاندن و دانانی شەرعی خوا و دینی ئیسلام لەسەر ڕووی زەوی.

– له مادەی(٦٨)هاتووە:( الحرب الهجومية محرمة)مەبەست پێی جیهادە دژ بەم تاغوتانە!

٣–المحكوم فيه: بریتییە لە کاروکردەوەی بەندەکان، بەڵێ بەندەی تاغوتەکان کە گوێڕایەڵی ئەو سەرکردانەن کە شەرعی پەروەردگاری گۆڕیوە، وە ئەم بەندایەتیەش بۆ تاغوتان سزایەکە بۆیان لەلایەن خواوە بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە خوا ڕێزی لێناون بە تەنها پەرستنی خۆی، خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُلۡ هَلۡ أُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيۡهِ وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ وَٱلۡخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَۚ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴾.

٤–المحكوم عليه:خودی ئەم بەندانەیە کە گوێڕایەڵی تاغوتان دەکەن لە حەڵاڵکردن و حەڕامکردن بەبێ هیچ بەڵگەیەك لەلایەن خواوە.

ئەی خوێنەری بەڕێز پاش باسکردنی ئەم بابەتە، کە بابەتێکی ڕوون و ئاشکرایە وە لە پێغەمبەران لە پێناویدا ڕەوانەکراون، وە ڕێگای ئیسلاممان بۆ ڕوون بۆوە کە بەتاك دانانی پەروەردگارە و دوورکەوتنەوەیە لە پەرستنی تاغووت و ئەو شتانەی لە غەیری خوا دەپەرسترێن، وەکو هاوەڵی خۆشەویست(ربعی بن عامر)کاتێك چوو بۆلای ڕوستم فەرمووی: ( إن الله ابتعثنا لإخراج العباد من عبادة العباد ، إلى عبادة رب العباد..... )واتە:(خوای گەورە ئێمەی ناردووە بۆ دەرهێنانی بەندەکان لە بەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای بەندە..) بۆیە با ئەم بابەتانە بەیادی یەکتر بێنینەوە، کە پەرستنی خوایە و ئەنجامنەدانی شیرکە کە لە دێرزەمانەوە پەیمانمان لێوەرگیراوە کە گوێڕایەڵ بین و ئێمەش دانمانپێداناوە،

وەکو خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ * أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾ .

وە مەرجی جێنشین بوونمان و گرتنە دەستی دەسەلآت لەسەر زەوی بەستراوەتەوە بە پەرستنی خوا و دوورکەوتنەوە لە شیرکە: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ وە بەهەمان شێوە بەیادتان دێنمەوە کە مەرجی چوونە بەهەشت و دوورکەوتنەوە لە دۆزەخ بەستراوەتەوە بەم بابەتە، بابەتی پەرستنی خوا بە تەنها و کوفرکردن بەتاغووت، وەك دەفەرمووێ: ﴿ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ یان ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴾ یان ﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴾.

برای موسڵمان کە ئەمەت زانی دەستی پێوەبگرە و هەوڵیش بدە لە پێناو خوا بۆ دەرخستن و ڕوونکردنەوەی کوفری ئەم تاغوتانە بۆ خەڵك هەرچییەك لە توانات دایە ئەنجامی بدە، وە گوێت سوککە بۆ وتەی(ابن القيم)و(القحطاني)لە نونییەکەیان بەڵکو ورە و هەڵسانێکت پێببەخشێ و غیرەت و جوامێری بگەڕێتەوە ناو لاشەت:

دەفەرموون:

فوحق من ختم الرسالة والهدى بمحمد فزها به الحرمان

لأقطعن بمعولي أعراضكم ما دام يصحب مهجتي جثماني

ولأهجونكم وأثلب حزبكم حتى تغيب جثتي أكفاني

ولأهتكن بمنطقي أستاركم حتى أبلغ قاصيًا أو داني

ولأهجون صغيركم وكبيركم    ولتحرقن كبودكم نيران

ولأكتبن إلى البلاد بسبكم    فيسير سير البزل بالركباني

إني لأبغضكم وأبغض حزبكم    بغضًا أقل قليله أضناني

لو كنت أعمى المقلتين لسرني    كيلا يرى إنسانكم إنساني

لم أدخر عمً لا لربي صالحًا    لكن بسخطي لكم أرضاني[٧٩]

له کۆتاییدا ئامۆژگاریم کردی ئەگەر گوێت له ئامۆژگاریەکانمە..... ئامۆژگاری بە نرخترن شتە کە ببەخشرێ .

چوارەم:ڕیبا(سوو):

خوای پەروەردگار ڕیبای حەڕام کردووە، وە ئاگاداری ئەو کەسانەی کردۆتەوە کە ئەم کارە دەکەن بە شەڕکردن لەگەڵ خوا تاوەکو وازی لێدێنن، دەفەرمووێ:(وأحلَّ الله البَيْع وحَرَّم الرِبا) ئەمە حوکمی ڕیبایە لە شەریعەتی خودای پەروەردگار.

بەڵام لە یاسا تاغوتیەکان وەکو نەریتی پێشویان مافەکانی خوای پەروەردگار زەوت دەکەن، ماڤی حەڵاڵکردن و حەڕامکردن، بۆیە ئەو دەسەڵاتە تاغوتیانە ڕیبایان حەڵاڵ کردووە تاوەکو خراپترین جۆری ڕیبا کە (ربا نسيئة) یە کە بریتییە لەوەی هەندێك پارە بە قەرز لە بانکەکان یان لە هەندێك کەسی بازرگان وەردەگیرێت، هەرکاتێك ماوەی قەرزەکە تەواوبوو کە دیاریکراوە قەرزەکەش نەدرابۆوە ئەوە ماوەکەی بۆ زیاد دەکەن بە بڕی سوود و قازانجێك، کە جاهیلیەکانی سەرەتا دەیانووت:(یان قەرزەکە بدەوە، یان ڕیبا و زیادە دێتە سەر)، بۆیە پارەیان زیاد دەکرد لەسەر قەرزوەرگر تاوەکو زۆر دەبوو، کە ئەمە ڕیبای جاهیلیەتی سەرەتابوو کە ئیسلام حەڕامی کرد، وە لە گشت کتێبە ئاسمانییەکان حەڕامکراوە، وە لە

---

[٧٩] خۆزگە ماوە برەخسابا بۆ ئەوەی ئەم بەیتە شیعرە بە چێژ و بەهێزانە شەرح بکەین بۆ سەر زوبانی شیرینی کوردی

هەموو شەریعەتەکان حەڕام کراوە، وە ئەو کەسەی ئینکاری حەڕامبوونی بکات لەلای هەموو زانایان بە کافر لە قەڵەم دراوە.

بەهەمان شێوە(ربا الفضل)کە خەڵکی ڕۆژگاری ئێستامان ئەمە دەکەن، کە سەدهەزار پارەی حازر لە بانك بە قەرز وەردەگرن بە سەد هەزار و نۆ هەزار تا ساڵی داهاتوو.

لە مادەی شەیتانی(١١٠) لە یاسای کڕین و فرۆشتنی کوێتی هاتووە:(زیادەی یاسایی لە کارە بازرگانییەکان بە بڕی حەوت لە سەدا٧٪دەبێت).

وە لە مادەی(١١١)هاتووە:(درووستە بۆ کڕیار و فرۆشیار ڕێك بکەون لە نێوان خۆیان لەسەر نرخی کۆتایی سوو، کە نرخەکەی لە بانکی ناوخۆیی زیاتر نەبێت کە ئەوکەسەی پێی هەڵدەستێ بریتییە(مجلس ادارة البنك)لەدوای ڕیپێدانی وەزیری دارایی).

وە لەیاسای کۆمپانیا عەڕەبیەکان بۆ وەبەرهێنانی نەوت هاتووە کە بارەگاکەی لە(الدمام)ە لە شانشینی سعودییە:(بڕیاردرا بە جێبەجێکردنی یاساکانی بۆ ساڵی١٣٩٤ھ،١٩٧٤م، کە لە فەصلی دوو لە ژێر ناونیشانی(أغراض الشركة وعملياتها)لە مادەی(٧)کە هەموو قەرزێکی مام ناوەند و درێژ قەدەغە دەکرێت بۆ پارەدارکردنی کەرتی وەبەرهێنان و یەکە نەوتییەکان وە کۆمپانیا ڕەچاوی ئەو ڕێگرییە دەکات لە کاتی قەرز بۆ پرۆژەی دەوڵەتێك لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لەسەر ئەستۆی ئەو دەوڵەتە بۆ جێگیر بوونی قەرزەکان و سودگەیاندن پێی).

لە مادەی(٨–)هاتووە:(کۆمپانیا ڕەچاوی ئەم بارە دەکات لە کاتی قەرز وەرگرتن کە لە ئەستۆی وڵاتە بۆ سوودی زیاتر لە بڕی قەرزەکان).

ئەگەر دەتەوێ زیاتر بۆت ڕوون بێتەوە و دڵنیا بیت ئەوە بڕۆ بۆ حەج یان عەمرە ئەو کات دەبینی بانکی سعودی ئەمریکی و، بانکی سعودی فەڕەنسی و، بانکی سعودی بەریتانی و، بانکی سعودی هۆڵەندی و، بانکی سعودی سویسری..... لەناو حەڕەمی مەککە و مەدینە بوونیان هەیە کە کڕین و فرۆشتن بە ڕیبای تێدا ئەنجام دەدرێ، کە زانا بەڕێزەکانیش شاهێدن لەسەر ئەمە و لەبەرچاوی ئەمان ئەمە دەکرێ!!شیخ عبدالعزيز بن باز، شيخ ابن عثيمين و شيخ ابن جبرين و جگە لەمانەش لە زاناکانی(هيئة كبار علماء السعودية)!!!!لە کاتێك لە

بابەتی پۆشینی نیقاب وتەکانیان لە جیهانی ئیسلامی دەنگی داوەتەوە! بەڵام نازانین بابەتی بە حەلاڵدانانی ڕیبا لای ئەمان دوو قسەی لەسەرە!!یان ناگاتە پلەی حەڕامێکی ئاشکرا لە شەڕعدا!!! خودا بمان بوورێت.

پێنجەم: سزای تۆمەت هەڵبەستین بۆ ئافرەتی داوێن پاك(القذف):

پێناسەکەی:(رمي المسلم غيره من المسلمين بالزنا) واتە:(تۆمەت هەڵبەستینی موسڵمانێکە بۆ موسڵمانێکی تر بە زینا)خوا دەفەرمووێ:(والذين يَرمونَ الُمحْصَنات ثُم لَم يأتُوا بأربَعة شُهداءَ فاجْلدوهُم ثَمانين جَلدة ولا تَقبلوا لَهم شَهادة أبداً وأولئك هُمُ الفاسِقون).

ئەمە حوکمی قورئانە کە هەشتا جەڵدەی لێدەدرێ، وە شاهێدیشی لێ وەرناگیرێ، وە دەچێتە ڕیزی فاسیقەکان.

با بزانین حوکمی یاسا تاغوتیەکان چییە؟!

لە مادەی شەیتانی(١٣٠)هاتووە دەربارەی القذف:(سزادەدرێ بە زیندانی کە لە دووساڵ زیاتر نەبێت، وە سزادانی ماددی کە لە سەد جونەیهی زیاتر نەبێت بۆ کەسێك کە شتێك بدات پاڵ کەسێك بە ئاشکراکردن و دیاریکردن و ڕوودان ).

وە لەمادەی(٣٠٣)هاتووە:(....سزادەدرێ بە زیندانی کە لە دووساڵ زیاتر نەبێت، وە سزادانی ماددی کە لە بیست جونەیهی کەمتر نەبێت و لە سەد جونەیهیش زیاتر نەبێت، یان بە یەکێك لە سزاکان!)[٨٠].

شەشەم:تاوانی نێربازی(لواط):

پێناسەکەی:(مواقعة رجل رجلاً) واتە:(چونە لای پیاو لەلایەن پیاو)، وە سزاکەشی کوشتنی هەردوولایەنە(الفاعل والمفعول)کە لە فەرموودە هاتووە لە(ابن عباس) کە پێغەمبەری

---

[٨٠] (راجع موسوعة القضاء للدول العربية)

